بەرەو چارەسەرێکی گونجاو

# ڕۆڵی زانایانی ئایینی لە پێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی دا

## THE ROLE OF RELIGIOUS SCHOLARS IN TRAINING POLITICAL LEADERS

د. إدریس کریم کاریتانی



# ڕۆڵی زانایانی ئاینی لەپێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی
## نیزام پادشا - ئاق شەمسەدین. بەنموونە.

**نووسینی: د. ادریس کریم کاریتانی**



چاپی یەکەم١٤٤٥ك -٢٠٢٣ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

 /TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
کاریتانی، ادریس کریم
ڕۆڵی زانایانی ئاینی لەپێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی نیزام پادشا - ئاق شەمسەدین بەنموونە، د. ادریس کریم کاریتانی(نووسەر).
٧٦ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، فیکری، مێژوویی
ISBN: 978-9922-690-28-5

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٧٩٥) ی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین، نووسینگەی تەفسیر

بەرەو چارەسەرێکی گونجاو

# ڕۆڵی زانایانی ئاینی

## لەپێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی

## نیزام پادشا - ئاق شەمسەدین بەنمونە

هەوڵێک بۆ ناساندن و گێڕانەوەی ڕۆڵی
زانایانی ئاینی لەپێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی

د. ادریس کریم کاریتانی

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾

﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤۡتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادًا لِّي مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ ٧٩﴾

آل عمران: ٧٩

## دیاری بۆ:

- ئەو زانایانەی گرنگی بەپێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی دەدەن.

- ئــەو زانایانــەی ئیســلام وەك مەدرەســەی پێگەیانــدنی قیــادەو سەرکردەی بەهێزو سەرکەوت و دەزانن.

- ئەوانەی حوجرەو مەدرەسەی زانستی شەرعیان هەیە، بۆ ئــەوەی چاو لەم کەڵە زانایانە بکەن بۆ پێگەیاندن.

- بۆ ئەوانەی ژیانی گەورە پیاوان و زانایانی خۆیان ناناسن کەجیان کردوە بۆ خزمەتکردنی ئیسلام و گەیاندنی بەجیهان.

- بۆ ئەوانەی دەیانــەوەی ســود لەمەنهەجیــەتی زانایــانی پێشــوو وەربگرن بۆ پێگەیاندنی تاکی سەرکردە.

- بۆ ئەوانــەی لەمەیــدانی کــاری دەعــوەو بانگــەوازین تــا بــزانین مەدرەسە بەبێ دەست گرتن بەهەردو لایەنی دەعەوی و سیاسی ئەنجامی نابێ.

- بۆ ئەوانەی بەدوای هەمومی ئومەدا دەگەڕێن و غەمی سەرخستن و گێڕانەوەی شکۆی ئیسلامیانە لەڕێی زانایانی سەرکردەی سیاسی.

# پێشەکی:

سوپاس وستایش بۆ ئەو خودایەی کەوا ئەم قورئانەی بۆ سەر بەندەی خۆی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دابەزاندووە، مردن و ژیانی بەدیهێناوە تا تاقیمان بکاتەوە کێمان کردەوەی باشتر وپەسەندترە، درووود و سەلامی خودا لەسەر ئەو کەسەی کەنێردراوە تا بە گووتە و کردارەکانی ڕەوشت و ئاکارە باشە مرۆییەکان تەواو بکات، ولەسەر یار و یاوەرانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژیی دوایی.

پاشان: بێگومان بەرنامەو پەیامەکانی خودایە کە نەوەی ئادەمی (علیه السلام) کردووە بەجێنشین لەسەر زەویدا، نیعمەتەکانی خۆی پێ بەخشیون، پێغەمبەرانی بۆ ناردوون تا مرۆڤەکان بە دادپەروەریەوە ڕەفتار بکەن، وپێغەمبەرانیشی بەڕێزدارترینیان کۆتایی پێ هێناوە کە محەمەدە (صلی الله علیە وسلم)، هەروەها یاسا و ڕێسا وبەرنامەیەکی پاك وبێگەردی لەگەڵدا ناردووە، کە دوورە لەهەموو گۆڕین ودەستکاری کردنێك.

لەدوای خۆشی هاوەڵانی بەڕێزی بەکارەکە هەستاون، بینای ئیسلامیان بەرز وبالاتر کرد، فەرمانڕەوایەتی مرۆڤەکانیان بەزانست ودادگەری بەڕێوەبردووە، نیشانەو شوێنەواری دەوڵەتی ئیسلامییان بەهەمو دونیا ناساندوە، ئەو کەموکورتییانەی کەلەدەولەتداری دروستبوە بۆ چارەسەری گەراونەتەوە لای زانایانی خوا ناس و ڕەبانیەکان، ئەوانیش کۆکەرەوەی

زانست وتێگەیشتن بوون لەدین، بەئاگابوون لەسیاسەت وبەڕێوەبردندا، لەبەرئەوەی زانا خواناس وڕەبانییەکان کۆڵەکە و پایەی خەڵك بوون لەتێگەیشتن لەدین ولەزانست ولەکاروباری دین ودونیادا [1].

ئەگەر ئومەت تواناو ووزەی هەستانەوەی شکۆی خۆی هەبێت، بەپەرۆش بێت بۆ گێڕانەوەی قەدر و گەورەییەکەی، ئەوا تاکە ڕێگا کە دووەمی نیە بریتییە لە گرنگیدان بەزانا خواناس و ڕەبانییەکان وگەڕانەوە بۆلایان لەزانست وپەروەردەدا، لەسیاسەت ولەحوکمڕانیدا، لەدابونەریت وئاکارو ڕەوشتدا، لەئابووری و گەشە پێداندا، لەجەنگ ولەئاشتیدا، لەسەرجەم کایەکانی ژیاندا، لەبەرئەوەی دین ودونیاشمان جێگیر نابێت بەوەوە نەبێت[2].

زانایان بە درێژایی سیانزە سەدە گرنگیان بە مەبەست و ئامانجەکانی شەریعەت و بنچینەکانی دەوڵەت و بیروڕای سیاسی وتێڕوانین بۆ شارستانیەت و ڕۆشنبیرییە بەرزەکەیان داوە، ئەوان توانیویانە سەدان سەرکردەی سیاسی وسەربازی دروست بکەن، بیانکەنە سەرکردەی ئاوەدانی وبوژاندنەوە، نەك تەنیا بۆ موسڵمانان، بەڵکو بۆ هەموو جیهان. هەروەها لەپێناو ژیان و ئازادی و ئاوەدانی وبەختەوەری وشارستانێتی، ئەم شۆڕشە تەکنەلۆژیەی کەئێستا لەڕۆژئاوادا هەیە، ئەوە لەدەرئەنجامی شەونخونی زانایان و بیرۆکە ئیسلامیەکان و بەرهەمی سەرکردە سیاسیەکانە، کەلەسەر دەستی زانایان پەروەردە و گۆشکراون، ئەمڕۆش جارێکی دیکە پێویستمان بەگەڕانەوەیە بۆ سەر بەرنامەی ڕاست و

---

[1] بروانە: الجامع البيان للطبری. (٣٢٧-٣).

[2] بروانە: أثر العلماء في مشروع النهضة، د. يحيى بن أبراهيم اليحيى . ص ٧..

دروستی  زانایانمان لەبواری فێرکردن وپــەروەردەکردن، ســەرکردایەتیکردن ودروســـتکردنی ســـەرکردەی سیاســـی و ڕۆشـــنبیر، ئێمـــە پێویســـتمان بەتێڕوانینی زانایانە لە  بواری دیاریکردنی دیدگای سیاسی وتێگەیشـتنی لــە واقیــع وحەقیقــەت، پێویســتمان بــەزانایانمان هەیــە بــۆ گێڕانــەوەی شکۆمەندی وبەها و ڕێزگرتن و کەسایەتی مرۆڤـ، جارێکی تر پێویستمان بەزانایان هەیە بـۆ  ئامۆژگـاریکردن و ڕێنمـونی کردنمـان بـۆ ژیـان، بـۆ بەرنامەی پەروەردە و فێرکـردن، هــەتا لەســەرپێی خۆمــان بوەســتین  بـۆ ڕزگاربوون لەسایەو سێبەری ســتەم و چەوســاندنەوەو تــاریکی ســەردەمی سیکۆلاریزم و عەلمانیەت . لەماوەی سیانزە ســەدەی ڕابــردوودا زانایــانی موسڵمان پێشەنگی شۆڕش وسەرکردەی گۆڕانکاری و  پێشەواو پێشەنگی چاکسازی بوون[1] .

ســەرجەمی ســەرکردە و ســەرکردایەتیەکان لەمێــژوویی ئیســلامیدا جێگە پەنجەیان لەگۆڕینی ڕێڕەوی مێژوودا دیــاربووە، پەرەســەندنی نــوێی گەورە لەسەر دەستیاندا بەدیارکەوتووە، ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕیوە، لەبــەر ئەوەی ئەوان زانای گەورە و، شێخ وزاناو دانای مەزن لەپشتیانەوە بــوون،

---

[1] تیبینی: لیکۆڵینەوەیەکم پێشکەش کرد لەتورکیا لەشاری دیاربەکر بەزمانی عەرەبی بەم ناونیشانە: (ئەو زانایانەی لەپشت ئەو سەرکردەو پێشەوایانە بوون کە ئاڕاستەی مێژووی ئیسلامی و ئازادکردنەکانیانەوە بوون، ئەو پرۆگرامە پەروەردەییەش کەلەو کارەدا پەیڕەوییان کردووە)، تویژینەوەیەکە پێش کەش کرا بە حەوتەمین کۆڕبەندی زانایان، ناونیشانی کۆنفرانسەکە ڕۆڵی زانایان لەگۆڕانکارییەکان وپێشخستنی نەتەوە بە زانست وفیکر، بەچاودێری یەکێتی زانایان وخوێندنگە ئیسلامییەکان. کەهودا بار سازی کردبوو، لەدیاربەکر : ١٥ ی سەفەری  ١٤٤٤ کۆچی، بەرواری  : ٩ ی ئەیلولی ٢٠٢٢.

دیارترین وێنەش سەرکردەی کوردی موسڵمان (سەلاحەدینی ئەیوبیە) کە زانــا ســەڵجوقییەکان لەپشــتییەوە بــوون وپشــتیوانیان لێکــردووە، (مەلیکشاھ) و (ئەلب ئەرسەلان) زانای گەورە (نیزام پادشا و، غەزالی و، خیام و، بیرۆنی) لەپشتیانەوە بوون، (تاریقی کوڕی زیاد) کـە ئەندەلوسـی ئازادکرد واتــە ئیســپانیای ئێســتا، زانــای ھەڵکــەوتوو وبلیمــەت (ئــەبو بەصــیری) لەپشــت بــوو، ســەرکردەی ئــازاو بــوێر (محەمــەد فــاتیح) قوستەنتینیەی ئازاد کرد، لەسەر دەستی زانــای ھۆشــیار وبلیمــەت (ئــاق شەمســەدین) پێگــەییوەو گــەورە بــووە، ئــەو زانــا بەڕێزانــە دیــدگای شارســتانێتی ئیســلامیان ھــەڵگرتبوو، ئاســۆی بیریــان زۆر فراوانبــووە، تێڕوانینیان بۆ خــوداو مرۆڤــ و ژیــان وگــەردوون تێڕوانینێکــی قورئــانی وشارســتانیانە بــووە، پەیامــە ســەرەکیەکەیان بــۆ تاکــەکانی ئومــەت ھاوولاتی بوون وداد‌گەری کۆمەلایەتی بووە.

ئەم زانا ھەڵبژێردراوانە مەشــق وڕاھێنانیــان بەســەرکردەکان کــردووە، لەســەرخزمەتکردنی مرۆڤایــەتی وبــەھا بالاکــانی ئیســلام، وپرۆگــرام وبەرنامەی خوێندن وفێرکردنەکەشیان پڕۆگرامێکی ھەستانەوە وچاکســازی و، ڕۆشنبیری و زانستی بــووە، کــە مرۆڤــی لــەقۆناغی چەوســاندنەوەوە دەگەیاندە قۆناغی داھێنان وگەشەکردن .

لەم کاتەی ئێستاماندا ژمارەیەکی زۆر زانا و ووتاربێژ وئامۆژگاریکار ھــەن، بــەلام بەشــێکیان گرفتــی لاوازی ڕۆشــنبیری ونــەبوونی تێڕوانینــی شارستانیان ھەیە، ھەڵگری پەیام و ڕیسالە نین، ھەر بۆیە پێویســتمان بــە

پەرەپێدان وگۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن وفێرکردن و زانستە ئیسلامیەکان هەیە، کەموکورتی لەبیرکردنەوەی شارستانیانە وئیجتیهادی مەبەست و ئامانجەکانی شەریعەتدا هەیە، کەموکورتی لەشێوازی بەڕێوەبردن وئابوری لەپرۆگرامەکانی خوێندن و زانستە شەرعیەکاندا هەیە کە لەخوێندنگە شەرعیە هاوچەرخەکاندا دەخویندرێن.

دەستنیشانکردنی خاڵی لاواز وپێشنیازکردنی چارەسەرەکان و وەستانەوە لەسەر هۆکارەکانی ئەو پاشەکشەیە ودواکەوتن و لاوازییەی کە لەجەستەی جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبۆتەوە وتەشەنەی کردووە، کاریکی واجبە و پیویستەکاری بەردەوامی لەسەر بکرێت و دەیان گۆنفرانسی لەسەر بگیرێت. وەك جولانەوەیەکی فکری و هۆشیاری بۆ زانایان و بیرمەندانی ئێستا کەهەست بەبەرپرسیاریەتی راستەقینە دەکەن و هەڵگری فکری تەوحیدی شارستانیین.

لەم کتێبەدا شێواز وپرۆگرامی پەروەردەیی دووان لە زانایانی ئیسلامم لە سەدەکانی ڕابردوودا باسکردووە، کە زۆر هیمەت بەرز بوون، هەردووکیان خەمی پێگەیاندن و ئامادەکردن و دروستکردنی سەرکردەیان هەڵگرتووە لەپێناو هەستانەوە و پێشکەوتن وچاکسازی، پێم وایە ئەوەی کە ئەوان ئەنجامیانداوە خودای گەورە لە هەردووکیان خۆش بێت نمونەیەکە کەشوێنیان بکەوین ورێگایەکە وپرۆگرامێکی پەروەردەییە کەپێیدا بڕۆین، ڕەنگە زانایانی سەردەم و ریکخراوو و دەزگاکانی

پیگەیاندن و دەروونێکی باش وچاك بیبینێت پیّ ی وابێت پشت بـەخودای گەورە هاوکار دەبێت و مەنهەجەکەیان دەکاتە بنەما بۆ هەسـتانەوە و بـۆ ئەنجامدانی چاکسازی ودروستکردنی سەرکردە لەسەردەمی ئێستاماندا.

## خوێنەر:

بۆ بەرچاو ڕونی خۆینەر ئەم نوسراوە بۆ ئەوە نیە ژیننامەی زانایان بخەمە ڕوو، لەسەر لەدایك بون و ڕەوڕەوەی ژیانیان قسە بکەم، وەك سەردێکی مێژوی ژیاننامەیان، بەڵکو بۆ ئەوەیە لایەنی فکری سیاسی و ڕۆڵی پێگەیاندن و پەروەردەییان، نەهج و شێوازو بیروکەی پێگەیاندنیان دیاری بکەین، لەکتێبە مێژویەکاندا تەنها باسی سەرکردەی سەربازی و سیاسی دەکرێت، چۆن فتوحاتیان کردوە، لەکاتێکدا هیچ سەرکردەیەکی سیاسی بەهێزو ناودار نیە لەسەر دەستی زانایانی ئایینی پێنەگەیشتبن، دیدگای شارستانیەت و تەوحیدی، بیری خۆشەویستی ئیسلام و مەبدەئو ئومەت و حەق و عەدالەتیان لەناخی سەرکردە سیاسیەکان چاندوە. بۆ ئەم مەبەستە لێرەوە میتۆد و مەنهەجتیان باس کراوە، نەك ژیاننامە. هۆکاری دیاری کردنی ئەم دوو کەڵە زانایەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەوانە لەپشت پێگەیاندنی دوو سەرکردەی سیاسی و سەربازی بەهێزبون، مێژویان کۆڕیوە، گەورەترین فتوحاتیان لەژیانی سیاسی دا کردوە، ئەلب ئەرسەلان جەنکی مەلازکرد)[1]، ی بردەوەو سەرکەوتنی بۆ موسلمانان

---

(١) ئەم جەنگە لە( ٤٦٣هـ= ١٠٧٠م). رویدا لەنیوان دەولەی سەلجوقی بەسەرۆکایەتی الب ئەرسەلان، لەگەڵ بیزەنتینەکان، لەم جەنگەدا بیزەنتیەکان شکان و ئەلب ئەرسەلان سەرکەوت. دەرئەنجامی ئەم جەنگە بەهیزی پەیوەندی نێوان نیزام پادشای وەزیرو ئەلب ئەرسەلانی سولتانی سەلجوقی بەهیز تر بوو، بوە هۆی گەشەو بلاوبونەوەی دەولەتی سەلجوقی، سنوری دەولەتی سەلجوقی فراوان کرد تادەسەلاتی ←

تۆمار کرد، ڕێڕەوی میژوی گۆرگی بۆ زیاتر لە١٠٠٠ ساڵ، بەپشتیوانی زانای ئاینی خواناس نیزام پادشا، هەروەها محمد فاتح فەتحی قوستەنتینیەی کرد، جەنکێکی مێژویی بو کۆتایی بەئیمپراتۆریەتێك هێنا. لەم دوو جەنگەدا تەنها ناوی سەرکردەی سیاسی و سەربازی دێت، لەکاتێدا زانایانی ئاینی لەپشت ئەم سەرکەوتنە گەورەیە بون، بۆ ئەوەی زانایانی ئاینی ئەم مەشهەدانە بکەنەوە پەند و بەخۆداچونەوە، بەکاری خۆیان هەستن و پیاوانی سیاسی و سەربازی پێبگەینن.

---

بەسەر بیلادی شام بەگشتی و بەشیکی زۆر لەبیلادی رۆم گرت، نفوزو دەسەلاتی درێژەی کێشا بۆ کرمان و ئاسیای بچوك، دەوڵەت لەچەند لایەکەوە باڵی ڕاکێشا بۆ لایەنە جیاوازەکان، باڵی ڕاکێشا بۆ سنورەکانی هیندو سین لەلای ڕۆشهەلات، لە رۆژئاواوە بەرەو دەریای ناوەراست، هەروەها لەدەریای رەشەوە لەرۆژهەلات، بەرەو جەزیرە بەرەو باشور، بوە گەورەترین هیز لەجیهان.

## سودی ئەم کتیبە چیە؟

وەك لەنوسراوەکانی پێشوم ئاماژەم کردوە نامەوی کتێبێك بنوسم کۆکراوەی زانیاری بێت کەلەکتێبەکانی تر هەن، یان تەنها باس و بەسەرهاتی مێژوو و ڕابردو بێت، یان بابەتێك بێت نەتوانی چارەسەر واقعێکی ئێستای پیّ بکرێت، ئەوەی لێرە نوسراوە ڕۆلی زانای ئاینیە لەدروستکردن و پێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی، لەڕوی سیاسەت و فکرو ڕیسالە وسەربازیەوە، بەبیرو دیدگای تەوحیدێکی شارستانی، لەسەردەمێك ئەم نوسراوە دەخەمە بەردەسستتان کەبەشێکی زۆر لەزانایانی ئێستا، یا بەلای کەم مامۆستای ئایینی وتاربێژەکان ڕۆڵیان زۆر لاواز بوە لەپێگەیاندن، هەروەها وردە وردە کەوتونەتە ژێر خیتابی عەلمانیەکان، وتارو ئاڕاستە و تەدریسیان کورت کردۆتەوە لەزانستی ڕوت، تەنها گرکی بە لایەنی تەدەیون و ئەخلاقیات دەدەن، بەتەواوی دور کەوتونەتەوە لەفکری سیاسی و ڕیسالّی، ئەوەندەش نا زۆرچار لەکۆڕو سیمینارو ئاڕاستەکانیان بەئاشکرا ئەم فکرە عەلمانیەتە بلاّو دەکەنەوە لەناو زانایان، دەڵێن ئێمە تەداخول بەسیاسەت ناکەین و تێگەڵی سیاسەت نابین، پەیوەندیمان بەسیاسەت و دەوڵەت و دەسەلاّت نیە، ئەمەش دەیان سەلبیاتی لیّ کەوتۆتەوە، زانای ئایینی ئێستای والێکردوە، خوێندنەوەی سیاسی نەبێت و ئاگادری واقیعی ئێستای نەبێت، ئیسلام و سیستەمی ئیسلامی لەبواری سیاسەت و فکرو پەروەردەو سەربازی و ئابوری و بەشەکانی تر لەواقیع و ژیان دابڕێت، بەرەو جۆرێکی تر لەفکری عەلمانی بچین، بەلاّم ئەم چارەی لەسەر دەستی

مارتن لۆسەرو ڕۆژهەلاتناسەکان نا! بەڵکو لەسەر دەستی بەشێك لەزانایانی ئایینی خۆیان، عەلمانیەکانیش لەجیهانی ئیسلامی و لەکوردستان ئەم جۆرە ئاڕاستەو بیرۆکەیان لازۆر گرنگە- کاری لەسەر دەکەن، ئەو مامۆستا ئایینی و زانایانەی گرنکی بەم بوارە بدات و دین لەژین جیابکاتەوە، زیاتر ڕیزی لیٚ دەگرن و پێداویستی ژیانی بۆ دابین دەکەن، لەکاتێکدا ئەم سەرکردە سیاسی و سەربازیانەی ڕۆلیان بوە لەبینای شارستانیەت و فراوان کردنی دەسەلاٚتی ئیسلامی لەجیهان، دونیایان فەتح کردوە، زانای ئایینیان لەپشت بوەو لەسەر دەستی ئەوان پێگەیشتون، فکری ڕیسالی و سیاسی و سیستەمی ژیان لەوانەوە فیربون، چواردە سەدە لەدەسەلاٚتی ئیسلامی بیٚ پشتگیرو پالٚپشتی زانایان هەنگاو نەنراوە، بەتایبەتی ئەو زانایانەی دەستی بالاٚیان هەبوە لەدامەزراندنی خۆیندنگەو دانانی مەنهەجی فکری و ڕیسالٚی، هەروەها گرنکی دان بەپێگەیاندنی سەرکردەو سیاسەت مەداری ناودارو وشیارو شارەزاو واقیع ناس. لەبەرامبەردا سەرکردەی سیاسی لەزانایانی خواناس و شارەزا دانەبڕاون، نەوەکانی خۆیان هەر لەمندالٚیەوە خستۆتە بەر دەستی زاناکان، تاپێیان بگەینن بۆ سەرکردەی سیاسی و سەربازی و فکری داهاتوو، ئەو زانایانە خودایی بون و خواناسی و هەمی ئیسلام و ئومەی ئیسلامی ئامانجی سەرەکیان بوە، بونەتە ڕەبانی بەتەدریس و دیراسەی قورئان، سەرکردەکانیشیان هەر لەسەر هەمان نەهج بەروەردە کردوە، خودای گەورە یاسای ڕەبانیەتی زانای وا داناوە، دەفەرموێت:

﴿ وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ ٧٩ ﴾ آل عمران: ٧٩.

بەداخەوە ئێستا یان لەبەر ترسی دەسەلاٚت، یان لەبەر بەرژەوەندی

کەســـی و هەنـــدی بەرژەوەنـــدی مـــادی، خەریکـــە بەشـــێك لـــەزاناو مامۆستایانی ئایینی مەنهەجیەتی ڕاست و تـەواو بگـۆڕن لەئیسـلامێك کەدونیاو دوارِۆژ، عـەقلّ و نـەقلّ، لاشـەو ڕوح، دیـن و سیاسـەتە، لاری بکەنەوەو بەئاڕاستەیەکی ناتەندروست و شەلی ببەن، ئیسـلام وەك ئـاینی مەسیحی پێشانی خەڵك بدەن، کەئیسلام پەیوەندی بەسیاسەتەوە نیە، یان ئیسلام بەسیاسەت پـیس مەکـەن، یـان بـەناوی جیـا جیـاوە دەوڵـەت و سیاسـەت و بـەڕیوەبردن و ئیـدارە و ئـابوری لەئیسـلام داڕنـن، بیکەنـە سوفیگەری سەردەم و پەرژەوەندی خۆیانی پـێ بپـارێزن، بۆیـە مـەنهجی پێگەیاندن و پەروەردەی ئەم دوو زانا خوانـاس و شـارەزاو خـاوەن فکـری سیاســیەم لـیرە هەڵبـژارد، وەك مەدرەســەیەکی پێگەیانـدنی سـەرکردە سیاسیەکان چاویان لیّ بکرێت، بکرێنە پێشەنگی ئێستا، زانایان جارێکی تر موراجیعەو بەخۆداچونەوە لەخیتاب و ئاڕاستە و خۆیندنگاو مەنهەج و فکرو وتاریان بکەنەوە، ئاگاداری ژیان و نەهجی پێگەیاندنی سەرکردەکان بن لەلایەن زانایانی ئایینی، بزانن کەزانایان قەد دانەبڕاون لەپێگەیانـدن و پشتگیری سیاسەت و حوکم و دەسەلاّتی سیاسی ئیسلام.

## بۆچی ئەم بابەتەم هەلبژارد؟.

ئەو تەنگەژە وقەیرانانەی کە ئەمڕۆ ئومەتەکەمان پێدا تێپەڕ دەبێت زۆر وگەورەن، ڕەنگە بتوانین لەووشەی( وونبوون) دا کورتی بکەینەوە، بەڵێ ئێمە گیرۆدەی ( وونبوون) بووین لەسەرجەم کایەکانی ژیاندا، ژیانی تیوری یاخود کردە دیینی و دونیاییەکان بووینەتەوە، هۆکاری ئەوەش نەبوونی دیدگای سیاسی ڕاست و دروست و پێشەنگی باش و سەرکردە وپێشەوای دڵسۆز و شارەزایە، ڕەنگە دروستکردنی پێشەوا وپێشەنگی باشیش لە سەرجەم کایەکانی ژیاندا، ئەو تاکە ڕێگەیە بێت کەئومەت بەرەو ڕێبازی چاك ودروست وبێداربوونی چاوەڕوانکراو دەگەیەنێت.

هەرکەسێك چاو بەمێژووی ئومەتەکەمان بخشێنێت و بەباشی سەرنجی بدات، هەر لەسەرەتای دامەزراندن و دروست بوونیەوە هەتا سەردەمی ئەمڕۆمان، دەگاتە ئەوەی ئەم ئومەتە بەدەست تەنگەژەو قەیرانێکی ڕاستەقینە وهەژارییەکی زۆر لەنەبوونی سەرکردە وپێشەوای خواناس و ڕەبانییەوە دەناڵێنێت.

ئەمەو ئەگەر سەردەمی خەلافەت (جێنشینی) هەلاوێرد بکەین وجیابکەینەوە، دەبینین سەردەمی ئەمەوییەکان، پاشان عەباسییەکان، وئەندەلوسییەکان، پاشان مەمالیکەکان، پاشان عوسمانییەکان، پاشان

سەردەمی نەمانی جێنشینی، پاشان ئەم سەردەمە نوێیەمان، ڕەنگە تۆ لەم سەردەمە یەك لە دواییەکانەدا مەگەر تەنیا یەك یاخود دوو یان ژمارەی بەپەنجەی دەستی سەرکردە وپێشەوای خواناس و ڕەبانیت لەهەر سەردەمێکیاندا بینی بێت.

ئەمەو سەرەڕای ئەوەی پێشەوایی وسەرکردایەتی کردنی خواناس وڕەبانی لەگرنگترین هۆکارەکانی پێشکەوتن و بەهێزبوونی ئومەتە، لەبەر ئەوەی سەرکردەو پێشەوایانی ئومەت بڕبڕەی پشتی ژیانیەتی، هاوشێوەی کەللەی سەر وایە بۆ جەستەکەی، چەندین سەرکردە و پێشەوای خواناس خودای گەورە ڕێنوێنی کردوون و ئامادەی کردوون تاوەکو ڕابەرایەتی کەشتی ئومەت بکەن، لەنێو دەریای پڕ شەپۆلی تێکشکێنەرانەی ئاژاوە و دووبەرەکی وتاقیکردنەوەکاندا و بەباشترین شێوە ڕابەرایەتیان کردووە و هیوای جەماوەر وئاواتی گەلانی بێ هیواشیان بەدی هێناوە، چەندین سەرکردەی ناپاکیش دین و ئومەتەکەیان فرۆشت بۆ ڕازی کردنی ئاغاکانیان چونکە ئەوانیان لەلا گرنگتر بووە، ڕازی بوونی ئەوانیان پێشتر خستووە هەتاوەکو بیان پارێزن، بۆ ئەوەی وەك چەسپێك لەسەر سنگی موسڵمانان بمێننەوە.

بەڵگەیەکیش لەسەر گرنگی سەرکردایەتیکردن دەبینین پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه مسلم) فەرمانی بەگوێڕایەڵی کردنی پێشەواو سەرکردەکان داوە، دەفەرمووی : (" اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، وَإِنِ اسْتُعْمِلَ

عَلَـيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِـيٌّ)[١]. واتـه: (گـوێگر وگوێڕایـەڵ بـن، هـەتا ئەگـەر بەندەیەكی حەبەشیش بووە سەركردە وپێشەواتان). پەیمانیشی لـەهاوەڵانی وەرگرتووە كەگوێڕایەڵی بكـەن، ولەسـەر ئـەوەش كێشـەیان بـۆ دروسـت نەكەن، واتە (بۆ سەركردەكان)، مەگەر بێباوەڕییەكی ئاشكراو دیاریان لێ دەربكەوێت، گوێڕایەڵی كردنی سەركردەی وەك گوێڕایـەڵی كردنـی خـۆی داناوە، دەفەرمویت: (مَن أطَـاعَنِي فقَـدْ أطَـاعَ اللَّـهَ، ومَـن عَصَـانِي فقَـدْ عَصَـى اللَّـهَ، ومَـن يُطِـعِ الأمِـيرَ فقَـدْ أطَـاعَنِي، ومَـن يَعْـصِ الأمِـيرَ فقَـدْ عَصَانِي).[٢].

واتە : ( ئەو كەسەی گوێڕایەڵیم بكات ئەوا گوێڕایەڵی خودای گەورەی كردووە، وە ئەو كەسەشی گوێڕایەڵیم نەكات ویاخی بێت ئـەوا گوێڕایـەڵی خودای گەورەی نەكردووە، وە ئەو كەسەشی گوێڕایەڵی پێشەوا وسـەركردە بكات ئەوا گوێڕایەڵی منی كردووە، وە ئەو كەسەشی گوێڕایەڵی پێشەواو سەركردە نەكات ئەوا گوێڕایەڵی منی نەكردووە.

كاتێك باس لەمێژووی مەزنی دەوڵەتی ئیسـلامی دەكـەین هەمیشـە جێنشین و سوڵتانە گەورە ومـەزنەكانی دەوڵـەتمان، ئەوانـەی كـە جـەنگان وئازادكردن وسەركەوتن وفراوان كردنیان ئەنجامداوە، بەبیر دێنەوە .

ئەوەشمان بیرنەچێت كۆمـەڵێك سەركردەی تر هەبوون كەڕۆڵی دیارتر ومـەزنتریان گێڕاوە لەوەی ئەو سەركردانە پێ ی گەیشتوون، كـە ئـەوانیش

---

[١] بوخاری گێراوەتیەوە، ٧١٤٢.

[٢] فەرمودەكە متفق علیە یە .

(زانایانن). ئەوانە کەسە مەزنە ڕاستەقینەکانن ئەوانەی کە ڕۆڵی گەورە و کاریگەریان بەئازادکردن و سەرکەوتەنەکاندا گێڕاوە، کاتێك ژیاننامەی سولّتانەکانی دەولّەت بەدرێژایی مێژوو دەخوێنینەوە، ئەوانەی کە گەورەترین ئازادکردن وسەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، وەك: (تاریقی کوڕی زیاد و سەلاحەدینی ئەیوبی و مەلیکشا کوڕی ئەلب ئەرسەلان و، محمدی فاتیح... هتد)، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کەلەپشت هەریەکێك لەو کەلّە پالّەوانانەوە زانایەکی گەورە و مەزن هەبووە، کە ماناکانی پیاوەتی وکۆڵنەدان و عیزەت، هەروەها مانای فیداکاری و، خۆشویستنی دین و قوربانیدان لەپێناویدا فێرکراون، هەروەها ماناکانی تێگۆشان لەپێناو بەرزکردنەوەی بەیداخەکەی، تێدا چاندوون.

کاتێکیش باس لەزانایانی دەولّەت دەکەین ئەوا باس لەپیاوانێك دەکەین کەپەروەردەیان باش بووە، ئومەتێك لەسەرکردە لەسەردەستیان گۆشکراون، فەرمانڕەوایەتی هەموو جیهانیان کردووە، باس لەکۆمەلّە زانایەك دەکەین کەلە هیچ سولّتانێك ودەسەلاّتدارێك نەترساون ودیینەکەیان بەدەستکەوتی ژیانی و دونیایی نەفرۆشتووە، کۆمەلّە زانایەك کە گوفتارەکانیان پێش کردەوەکانیان کەوتووە ولەڕیزی پێشەوەی تێگۆشەراندا بوون.

لەو زانا مەزنە ناودارانەش کە کەم کەس دەیانناسێت، شێخ و زانای خواناس وڕەبانیی وسیاسی بەئەزموون: (شێخ نیزام پادشا) و زانای تێگۆشەر (ئاق شەمسەدین) ە، لێرەدا باسێکیان لێوە دەکەین، هەولّ دەدەین بە کورتی و بەپوختی بۆ ئەوەی کورت و پوخت بیت و ئەوانەی

**مەبەستمانە لەم نوسراوە ئەوە بگات، خۆینەریش ئێستا حەوسەلەی خویندنەوەی کتێبی دورو درێژی نەماوە،  نامانەوێت بەشێوەیەکی گشتی باسیان لێوە بکەین.**

# ناسنامەو پێگەی کەسایەتی سیاسی و فکری زانای سەرکردە (نیزام پادشا)

**ناسنامەی زانای خواناس، مامۆستای پێگەیاندن، سیاسی دۆر بین، نیزام پادشا:**

زانای ئیسلامی نیزام پادشا سەرکردەی سیاسی بەئەزموون، زانای خواناس وڕەبانی، تێگۆشەری ئازا وچاو نەترس، پەروەرشیار شێخ و وەزیر (نیزام پادشا ٤٠٨ - ٤٨٥ کۆچی)، قەوام ئەلدین باوکی عەلی حەسەنی کوڕی ئیسحاقی کوڕی عەباسی توسی ناسراو بە (نیزام پادشا).

لەدوای نەوەی هاوەڵانەوە مێژووی ئیسلامیمان لێوانلێووە بەسەدان لەو زانایانەی کە شارستانێتیان بۆ ئیسلام دروستکردووە و چەندان سەدە لەنێو نەتەوەکاندا ماونەتەوە، لەو پیاوانەش کە بەگژی بیدعەدا (داهێنراوی نوێدا) چوونەتەوە و بەرنامەکەیان بلاوکردۆتەوە، دیینەکەیان پاراستووە و دادگەریان بلاوکردۆتەوە، ئەرك وپەروەردەکردنی نەوە وسەرکردەکانیان لەئەستۆ گرتووە، نیزام پادشا حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاقی توسی وەزیری مەزنی دەوڵەتی سەڵجوقییەکانە.

زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت : (الوَزِيْر الكَبِيْر، نِظَام المُلْك، قِوَامُ

الدِّين، عَاقلٌ، سَائِسٌ، خَبِيرٌ، مُتَدَيِّنٌ، عَـامِرُ المَجْلِس بِـالقُرَّاء وَالفُقَهَـاء، أَنشَأَ المدرسَة الكُبْرَى بِبَغْدَادَ، وَأُخْرَى بِنَيْسَابُوْرَ وَأُخْرَى بِطُوْسَ، وَرغَّب فِـي العِلْمِ، وَبَعُدَ صيتُه، وَزَرَ لِلسُّلْطَانِ أَلب آرسـلان، ثُـمَّ لابْنِـهِ مَلِكْشَـاه، فَـدبَّر مَمَالِكَه عَلَى أَتمِّ مَا يَنْبَغِي،وَخفَّف المظَالِمَ، وَرَفَقَ بِالرعَايَا، وَبَنَى الوُقُـوْفَ، بَهَرَ العُقُوْلَ سيرَةُ النِّظَام جُوْدًا وَكَرَمًا وَعدلًا، وَإِحيَاءً لِمعَالِم الدِّين) [١].

واتە: وەزیرە مەزنەکە، نیزام پادشا، ڕاگر وپایەی دیین، کەسێکی ژیـر وهۆشیار، بەڕێوەبەری کاروبارەکان، لێـزان وکارامــە، دینــدار وخوانــاس، کــۆڕو دانیشــتنەکانی پــڕ بــوون لەکەســانی خوێنــدەوار وشــەرعزانان، قوتابخانەی گەورەی لـە بەغـداد و، دانەیـەکی تـری لـە نەیسـابور[٢]، و دانەیەکی تریشی لە تـوس[٣]دامەزرانـد، زۆر حـەزی لـە زانسـت بـوو، ناوبانگێکی باشی لەنێو خەڵکیدا هەبوو وەزیری سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و لەپاشاندا کوڕەکەشی مەلەك شاهــ بـووە، زۆر بەباشـی شانشـینەکانی بەڕێوەبردووە، ستەم و چەوساندنەوەی کـەم کردۆتـەوە، نـەرم ونیـان بـووە لەگەڵ هاووڵاتیانـدا، وەقفـی بنیاتنـاوە، ژیـانی نیـزام لـە بەخشـندەیی ومیهرەبانی ودادگەری و زیندوو کردنەوەی زانستەکانی دیندا، خاوەن بیرو عاقڵمەندەکانی سەرسام کردووە.

ئیبن ئەثیر لەبارەیەوە دەڵێت : (وأما أخباره، فإنه كان عالماً، ديِّنـاً، جواداً، عادلاً، حليماً، كثير الصـفح عـن المـذنبين، طويـل الصـمت، كـان

---

[١] بروانە: سير أعلام النبلاء، ئیمام زەهەبی، نیزام پادشا، لا ١٤٤.
[٢] شارێکە لە خۆراسان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران.
[٣] لە گەورەترین شارەکانی خۆراسانە.

مجلسه عامراً بالقرّاء، والفقهاء، وأئمة المسلمين، وأهل الخير والصلاح)[١].

واتە: سەبارەت بە نیزام پادشا، پیاوێکی زانا، بەدین، بەخشندە، دادگەر، ئارامگر ولەسەرخۆ بووە، زۆر چاوپۆشی لەتاوانباران کردووە، کەسێکی زۆر بێدەنگ بووە، کۆڕ ودانیشتنەکانی پڕبوون لەکەسانی خوێندەوار وشەرعزانان و، پێشەوایانی موسڵمان و، کەسانی چاکە وچاکەخوازان.

نیزام پادشا گرنگی و بەهای پەروەردەی زانیوە، لەبەرئەوەی دروستکردن و بنیاتنانی مرۆڤ ئامانجی هەر هێزێکی چاکسازە لەکۆمەڵگەدا، بۆیە خوێندنگە نیزامییەکانی دامەزراند (٤٥٩ کۆچی) بۆ ئامادەکردنی پیاوانێك ئەوانەی کەبتوانن ئەرکەکان ڕابپەڕێنن، وە هەڵبژاردنی پەروەرشیارانێك کە زانست وخۆپاریزی لەتاوان (وەرع) پێکەوە گرێ بدەن، ئەو کارەشی بە ( ئەبی حامیدی غەزالی) سپارد تا لەخوێندنگەکەی بەغداد وانە بڵێتەوە، پێشەوای هەردوو حەرەمیشی (ئەبی مەعالی ئەلجوەینی) ڕاسپارد کە لەشاری نەیسابور وانە بڵێتەوە، خوێندنگەکانیش سەردەمانێکی دوورودرێژ بەردەوام بوون، بەتایبەتی خوێندنگە نیزامییەکەی بەغداد کە سەردەمانێکی دوورودرێژ بەردەوام بوو، نزیکەی چوار سەدەی خایاند .

---

[١] بروانە: الکامل فی التأریخ ئیبن ئەسیر، ج١٠ لا ٢٠٨.

ئـــەم خوێندنگایانـــە دەرئـــەنجامێکی بەرچـــاویان بـــەدیهێناوە، لـــە سەرەتاییدا دەرچوونی نەوەیەك کەلە ڕاستی ململانێ و مەترسییەکانی چواردەوری خۆی تێبگات و بزانێت لە باتنیەکان ( تایەفەیـەکی شـیعەیە) و خاچ پەرستان، وە شیاوی ئەوەن کەئەرکی بانگەوازکردن بـۆ مەزهـەبی سـوننە وسەرخسـتنی وبـەرگری لێکردنـی لەئەسـتۆ بگرێـت، (نـورەدین مـەحمود) سـوودی لەژمارەیـەکی زۆر لـەو زانایانـە وەرگـرت کەلـەو خوێندنگە نیزامییانە دەرچووبوون، لەوانە :

١- دادوەر کمالـە دیـن شـارەزووری (٤٩٢- ٥٧٢ کۆچـی) وەزیرێکـی نوورەدین خۆی بووە، کردی بەدادوەر وپاشان وەزارەتی پێ بەخشیوە.

٢- عیمـاد ئەصـفەهانی (٥١٩ - ٥٩٧ کۆچـی) کـە وەك مامۆسـتا لەهەندێك لەخوێندنگەکانی دیمەشقدا کاری کردووە، جگە لەوەی سەرۆکی دیوانی داڕشتن ودانان و نووسینی نوورەدین بووە .

٣- قوتبی نەیسابوری (٥٧٨ کۆچـی - کۆچـی دوایـی کـردووە)، ڕۆڵـی هەبووە لەبڵاوکردنەوەی سـوننە لـە حەلـەب لـە خوێندنگـەی (النفریـە النوریە)[١] دا.

[١] ناوی مەدرەسەیەکە لەحلب ، ئیستای سوریا. سەر بەمەدرەسەی نیزامی بوو.

## هەوڵە پەروەردەییەکانی نیزام پادشا وسەرخستنی سەرکردەکان:

نیزام پادشا بۆ ماوەی (سی ساڵ) کاری وەزیری بۆ سولّتان (ئەلب ئەرسەلان ومەلیك شاهـ) ی کوڕی ئەنجامداوە: (٤٥٥ — ٤٨٥ کۆچی)، و ڕۆڵێکی گەورەی لە پەروەردەکردنی سەرکردەکان وشکۆی هەژمون ودەسەڵاتی دەوڵەت هەبووە، لەسەردەمی ( ئەلب ئەرسەلان ٤٥٥ - ٤٦٥ کۆچی) دا سەڵجوقییەکان لەجەنگی (ملاژکرد) دا لەساڵی (٤٦٣) کۆچیدا، بەسەر ڕۆمەکاندا سەرکەوتن، (ڕۆمانۆس)ی ئیمپڕاتۆڕی ڕۆم بەدیل گیرا، وکاریگەرییەکی زۆری هەبوو، بەو هۆیەشەوە سەڵجوقییەکان لەئاسیای بچووکدا بڵاوبوونەوە، ڕووبەری زیاتر لە (٤٠٠ هەزار کیلۆمەتریان) بە خاکی ئیسلامەوە لکاند، ئەم ڕووداوەش گەورەترین پاشەکشە بوو لەمێژووی ئیمپڕاتۆڕیەتی بیزەنتیدا.

ولەسەردەمی (مەلیك شاهـ) دا، ( ٤٦٥ - ٤٨٥ کۆچی) شانشینەکەی زۆر بەرفراوان بوو، لەسنوورەکانی چینەوە بۆ داڕۆمی خاکی شامەوە هەواڵ وکاروباری ئەو ناوچانەی بۆ دەگەڕایەوە، یەمەن و حیجاز گوێڕایەڵی بوون، سەمەرقەند و سەرانسەری ناوچەی پشتی ڕووبار موڵکی ئەو بوون، باج وخەراجی لەپادشای قوستەنتینیە وەردەگرت [1].

هەروەك نیزام پادشا سنورێکی بۆ هەژمون ودەسەڵاتی باتنیەکان (تایەفەیەکی شیعەیە) دانا و فەرمانیدا لەهەموو شوێنێك ڕاوەدوو بنرێن.

---

[1] بروانە : عیون الروضتین، ج١، لا ١.

## ئومەت لەسەر دەستی زانایەکی خواناس و ڕەبانی نیزام پادشا دەژێیتەوە:

ئومــەت پێویســتی بەزانایــەکی خوانــاس و ڕەبــانی هەیــە کــە ئەرکەکەی : دروستکردنی نەوەو پەروەردەکردنی پاڵـەوانان و، دەرخســتنی بەهرەو تواناکان و، ڕازاندنەوەی دەروونەکان بــە بــاوەڕ و، مێشــکەکانیش بەزانست، لەگەڵ تێگەیشتنی ڕاست ودروســتی دینەکــەی خــوای گــەورە، هەر بۆیە پێویستە باوەشگەیەکی پەروەردەیی، زانســتی بدۆزرێتــەوە، بــۆ دروســتکردنی کۆمەڵــە کادرێــك کەئومــەی ئیســلامی بەڕێوەبــەرێت لەسەرجەم کایەکانی ژیاندا، نورەدین مەحمود و سەلاحەدینی ئـەیوبی لـە دروستکراوانی ئەو زانایانە بوون کەلەو خوێندنگـە نیزامیانـەوە دەرچـوون کە نیـزام پادشـا دایمەزرانـد بـوون .یـەکێك لـەگرنگترین ئـەو کێشـانەی کەڕووبـەڕووی ئومــەت دەبێتــەوە بــەهێزکردن وپتــەوکردنی ناوخۆیــەتی، پـــەروەردەش گـــرنگترین هۆکـــار وفاکتـــەرە کـــە شارســـتانێتی پـــێ هەڵدەسەنگێنرێت، کەسانی چاودێریکەریان لە نـاوەوە ولـەدەرەوە پێـدوور دەخەنەوە، بەدرێژایی سەردەمەکان ئەنجوومــەنی زانســتەکان بەشــدارییان لـــەهۆکارەکانی پێشـــکەوتن ومانـــەوەدا کـــردووە، لـــەگرنگترین ئـــەو ئەنجوومەنانەش خوێندنگە نیزامیەکانە کـە بـەخاڵێکی گـەش دادەنرێـت لەمێـــژووی شارســـتانێتی ئیســـلامی و مرۆڤایەتیـــدا، بەچـــاودێری وسەرپەرشتیکردنی زانای خواناس و ڕەبانی نیزام پادشا .

کاتێك باس لە زانای خواناس وڕەبانی وخوێندنگەی نیزامــی و، بــاس

لە دەوڵەتی سەلجوقی وسەرکردایەتیەکانی ئەلب ئەرسەلان و مەلیك شاهی کوڕی دەکەین، پێویستە باس لە ڕۆڵی وەزیری گەورە و (ئەتابەك) سەرکردەی باوك نیزام پادشاش بکرێت، وەزیر نیزام پادشا بە بەردی بناغەی دەوڵەتی سەلجوقی و بەیەکێك لە گرنگترین پایە وکۆڵەکە شۆڕشە یاسایی وئاوەدانی وکارگێڕییەکانی دادەنرێت، ڕۆژێك سولتان مەلیك شاه پێ ی دەڵێت: (قد رددت الأمور كلها كبيرها وصغيرها إليك، فأنت الوالد. وحلف له، ولقّبه ألقابًا من جملتها: أتابك، أيّ الأمير الوالد) [1].

واتە: من هەموو کارەکانم بەگەورە وبچووکیەوە بۆ تۆ گەڕاندۆتەوە، چونکە تۆ باوکمیت، وسوێندی ڕاستگۆیی بۆ خوارد، وچەندین نازناویشی لێنابوو لەوانە: ئەتابەك، واتە: پێشەواو سەرکردەی باوك.

نیزام پادشا شانشینەکانی خۆی بەباشترین شێوە بەڕێوەبردووە و سکاڵاکانی کەمکردۆتەوە، لەگەڵ هاووڵاتیانیدا نەرم ونیان بووە وئەوقافیشی بنیاتناوە، ئەو ئامۆژگاری سەرکردەکانی دەکرد، کەوا ئەو سەرکردە وپێشەوایانە دابمەزرێنن کە ڕەوشت و دین وبوێری وئازایەتییان تێدایە، کاریگەرییەکانی ئەم سیاسەتەش لە دواییدا بەدیارکەوتن، یەکێکیش لەو سەرکردانەی هەڵبژێردران (ئاق سەنکەر) ی باپیری (نورەدین مەحمود) بوو، کەفەرمانڕەوایی حەلەب و دیاربەکر و جەزیرەی دەکرد، ئەوەی (ئیبن ئەثیر) لەبارەیەوە ووتوویەتی: (من أحسن الملوك سيرة وأجودهم سريرة) [2].

واتە: پادشایەکە باشترین ژیاننامە ودڵسۆزترین نهێنی پارێزیان بووە.

---

[1] بروانە: الكامل في التاريخ، ج٦، ل٣٣٧.

[2] بروانە: البداية والنهاية، ج١٢، ١٥٧.

کۆڕو دانیشتنەکانی نیزام پادشا پڕبووە لە شەرعزانان و زانایان، زۆربەی کاتەکانی ڕۆژەکەی لەگەڵیاندا بەسەردەبرد، پێیان دەووت: ئەو کەسانە لەزۆرێك لەکارەکان سەرقاڵیان کردوویت، دەیووت: ئەو کەسانە جوانی دونیا و دواڕۆژن، (قیامەتن)، ئەگەر لەسەر سەریشم دایان بنێم ئەوا بەلامەوە زۆر نەبوو، ئەمەو هەر کاتێك ( ئەبو قاسم قوشەیری و ئەبو لمەعالی ئەلجوەینی) بچوونایەتە لای لەبەریاندا هەڵدەستایەوەو لەسەر کورسییەکەی لای خۆیەوە دایدەنیشاندن، هەر کاتێکیش (ئەبو عەلی ئەلفارندی) بچووایەتە لای لەبەری هەڵدەستایەوە و لەسەر جێگەکەی خۆی دایدەنیشاند، خۆشی لەبەردەمیدا دادەنیشت.

پێگەی ( دەزگای وەزارەت) گەیشتە ترۆپك و لوتکەی چاکسازی خۆی بەهۆی نیزام پادشاوە، کە چاکسازی کارگێڕی و زانستی بنەڕەتی ئەنجامداوە، لەسەردەمێکی هەستیاری ژیاندا جیهانی ئیسلامی ڕزگار کردووە، هێشتا بەرهەمە ئەرێنییە مێژووییەکانی هەتا ئەم ساتەش گەواهیدەرن بۆی، جا لەم ناوچەیەی خۆماندا بێت یاخود لەناوچە ئیسلامییەکانی تر، کە درێژبۆتەوە لە ئاسیای ناوەندەوە تاوەکو بەلقاندا. وەزارەتی ڕاسپاردنی ( بەڕێوەبردنی کاروباری هەموو دەوڵەت لەبری جێنشین) لەدەوڵەتی سەلجوقی وەرگرت، ژمارەیەکی ڕێکاری زانستی وسیاسی وسەربازی گرتەبەر، لەکۆتاییدا بووە هۆکاری بەهێزکردنی بیروباوەڕی مەزهەبی سوننە، لە بنچینە ولقەکان بەدرێژایی هەزارساڵی داهاتوو، وە پلانێکی چاکسازی زیندووکردنەوە وژیاندنەوەی پێشکەش کرد، ئەو پلانە لەزۆربەی دەوڵەتەکانی دواتردا کار بەناوەڕۆکەکەی کرا، وەك دەوڵەتی زەنکی لە موسڵ و شام و، دەوڵەتی ئەیوبی و مەمالیك، پاشان لەدەوڵەتی عوسمانیدا کە کۆتا دەوڵەتی ئیسلامی گشتگیر بوو.

## ئامانجە پەروەردەییەکانی خوێندنگە نیزامییەکان:

خوێندنگای نیزامی کەلەسەر دەستی قائیدو سەرکردەی سیاسی و زانای خواپەرست نیزام پادشا دامەزرا، دەیان وسەدان ئامانجی گەورەی هەبو، لەدیارترینیان پیگەیاندنی زانای خواناس کە پالپشتی قائیدی سیاسی و سەربازی بن، پیویستە ئێستا بیر لەدروستکردنی دەیان و سەدان مەدرەسەی لەم جۆرە بکرێتەوە، بەدیدگایەکی تەوحیدی شارستانی، بۆ بەرچاو رونی لەسەر ڕۆڵی ئەم مەدرەسەیە چەند ئامانجیك دەخەینەروو:

١- ئامادەکردنی سەرکردەی خواناس وڕەبانی سیاسی وڕۆشنبیر، لەسەر دەستی زانایان وبانگخوازان بەمەبەستی پاراستنی دین و دونیای خەڵك.

٢- ناساندنی بڕیارە شەرعییەکان بەخەڵك، بڵاوکردنەوەی بیری میانڕەوی سوننی لەڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕکابەرییەکانی بیری لادەر و باتنیە توندڕەوەکان ( تایەفەیەکی شیعەیە)، کارکردن بۆ کەمکردنەوەی هەژموون و دەسەڵاتی ئەم تایفە شیعیە، لەڕێگەی دۆزینەوەی کۆمەڵێك مامۆستای سوننەی شایستەو وشیار، بۆ فێرکردنی مەزهەب و ڕێبازی سوننە وبڵاوکردنەوەی لەهەرێمە جیاوازەکاندا . لەئێستادا عیراق و کوردستان هاوشێوەی ئەم حاڵەتە بلاۆ بۆتەوەو جارێکی تر بەشێوازێکی تر شیعەگەرایەتی خراپتر لەباتنیەکان دەستیان بەسەر عیراق داگرتوە،

تائیستا کوردستان پارێزراو بوە لەم شەبۆلە باتنیە نۆییە, بەجوهدو ماندو بونی زانایانی ئایینی[١].

٣- دابینکردنی کەشێکی زانستی جدی بۆ توێژەران وپسپۆران، هەروەك ئامانجی خوێندنگەکە ئەوەبوو کەشێکی زانستی دابین بکات کە یارمەتی وانەبێژ و مامۆستایان بدات، بۆ بیرکردنەوە و نووسین ودانان و داهێنان و هەموو شتێکی نویێ بۆ زانستە جۆراو جۆرەکان زیاد بکەن بەشێوەیەکی بەردەوام.

٤- کارکردن لەسەر فراوانکردنی ئاسۆی بیری خوێندکاران، ئەمەو ئەم خوێندنگایانە تەنیا کاری لەسەر گەشەسەندن و پەرەسەندنی کارامەییەکان نەکردووە، بەڵکو کاری لەسەر ئەوە کردووە کەخوێندکاران شارەزایی و کارامەیی نویێ بەدەست بهێنن لەدەرئەنجامی ئەزموونی ئومەتانی پێشین و هاوچەرخ[٢].

ئەم خاڵانە بۆ جارێکی تر بۆ ئەم سەردەمە زۆر گرنگن، هەمان گرفت

---

[١] بۆ زانیاری: لەسالی ٢٠١٣ لەشاری هەولیر لەشەقامیکی گەرەکی کوردستان، نزیك مزگەوتی بەندە ،٣٠٠٠ هەزار مەتر زەوی تەرخان کرا بۆ کردنەوەی حوسینیە، دەستیان بەبیناکردن کرد، بەهەوڵ و ماندو بونی مامۆستایان وزانایانی ئاینی هەولیر، ٢٠٠٠ هەزار واژومان کۆکردەوە، چوینە لای پاریزگار ئەو کات نەوزاد هادی بو، حوسینیەکەمان ڕاگرد، دواتر لەوێ زانیاری دزەی کردبو، بەڕای بەندە هەر دەسەلاٌت خەبەری دابونی کە (ادریس کاریتانی) بەم کارە هەستاوە، من ئەو کات لەبەغدا لەماستەر دەم خویند، ناویان دابوە سەیتەرەکان، بەلاٌم خودای گەورە ئاسانی کردو حوسینیەکە داخرا.

[٢] بروانە: مقالەیەك بەناوی (المدارس النظامیة وحاجة الامة لمنهجیة التعلیم البناء)، بلاوکراوەتەوە لەموقیعی: https:\\albosala.com .

و کێشــە ڕوبــەڕوی ئــەمڕۆی موســڵمانان بۆتــەوە، نــەبونی وشــیارای و نەخویندنەوەی واقیع نەخۆشیەکی کوشندەیە، مەدرەسە شەرعیەکانمان لەم ســەردەمە نــەیانتوانیوە چارەســەری بکــەن، هیــوادارم ســود لەئــەزمونی مەدرەسەی نیزامی و زانا نیزام پادشا وەربگرین.

## هۆکارەکانی سەرکەوتنی خوێندنگە نیزامییەکان:

دەوڵــەتی ســەڵجوقی پاڵپشــتی و دەســتبلاویەکی زۆری هــەبو بــۆ خوینــدنگا شــەرعیەکان، لەکاتێکــدا خوێندنگــەی نیزامــی هــات تــا پێداویستی و خواستی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بەجێ بگەیەنێت، هــەوڵی شۆڕشێکی زانستی لەچوارچێوەی باوەشگەیەکی ئیسلامیدا بدات، لەڕووی دابەشکردنی جوگرافییەوە، نیزام پادشا زۆر بەووریاییەوە شوێن و جێگــەی خوێندنگەکانی هەڵدەبژارد، بەشێوەیەك کە لەو پایتــەخت وشــارانەدا بــن کەدانیشــتوانیان زۆربــن و کاریگــەرییان هــەبێت. ئــەوەش بەشــێوەیەکی گەورەتر کاریگەرییەکەی دەستەبەر دەکات، جگــە لــە ووردی وگرنگیــدان بەهەڵبژاردنی مامۆستایان و وانەبێژان بەشێوەیەك کە زانــای ســەردەمی خۆیان بوون لەزانستە شەرعییەکاندا، عیماد ئەصفەهانی ئاماژە بەووردی نیــزام پادشــا دەدا لــەم بــوارەدا، کــە ماڵەکــەی کۆکــەرەوەی پیاوچــاکان وپەناگەی زانایان بــوو، کەســێکی هۆشمەنــد و زیــرەك بــوو، لــەبارودۆخی هەریەکەیانی دەکۆڵیــەوە وپێشــبینی شایســتەبوونی دەســەڵاتداریی تێــدا بەدی بکردایە، دەسەڵاتی پێ دەبەخشــی، ئــەو کەســەی دەیبینــی ســوود لەزانستەکەی وەردەگیرێت دەوڵەمەندی دەکرد، تاوەکو پێویستی بەکەســی تر نەبێت، پڕۆگرامــی خوێندنەکــە دیاریــدەکرا، هــەروەها نیــزام پادشــا گرنگــی بەهەڵبــژاردنی وانەبێــژان دەدا و هــەر بــۆ خۆشــی پڕۆگرامــی خوێندنەکەی دیاریدەکرد، ئەو خوێندنگایانە لەسەری دەڕۆیشتن وپیادەیــان دەکرد، ئەمەو توراسی ئیمامی شافیعی لە شەرعزانین و بنچینەکانی دین

و بیروباوەڕ گەورەترین کاریگەرییان لەسەر ئەو خوێندنگایانە هەبوو، لەگەڵ دابینکردنی سەرچاوە داراییەکان، نیزام پادشا ڕژدو ڕەزیلی نەکردووە لە دابینکردنی سەرچاوە داراییەکان، هاوکاری ئەوخوێندنگایانەی دەکرد بۆ بەرەو پێش بردنی پەیام و ئەرکەکانیان بەباشترین شێوە، هەربۆیە دەبینین ئەو زۆر بەدەستبلاوی بەبەخشندەییەوە خەرجی دەکێشان و کاتێکی زۆر وفراوانیشی بۆ تەرخان دەکردن [١].

ئەمڕۆ قوتابی حوجرەو زانستە شەرعیەکان بەهۆی نەبونی پاڵپشتی دارایی دەست لەبەر خەڵك پان دەکەنەوە، یان بەجۆریك هاوکاری دەکرین تاقوتابی دەبێتە مەلا بەردەوام چاوی لەدەستی خەڵك بێت، بەمەش شکۆی خۆڕاگری و سەربەخۆی فەتواو حەقبیژی لەگوتن لەدەست دەدات، کەدەبێتە مەلاش هەر چاوی لەدەستی خەڵکە ئەمە زەرەری زۆر لەکەسایەتی زانای ئاینی داوە، بۆیە وەك نیزام پاشا پێویستە چارەسەرێك بۆ ئەم بابەتە بدۆزرێتەوە تامەلاو زانا چاویان لەدەستی خەڵك نەبێت.

[١] بروانە: پیگەی ئەلکترۆنی، https:\\albosala.com.

## ناودارترین زانا ودەرچووانی خوێندنگە نیزامییەکان

ئەو زانایانەی لەمەدرەسەی نیزامی دەرچـون دەتـوانین بلّـێین رۆلّـی سەرەکیان هەبوە لەگۆڕانکاری و هەستانەوەو نۆی کردنـەوەی ئیجتیهـاد و تازەگەری، هەروەها وەك قوتبی زانست تەماشا کـراون، هـەڵگری فکـرو ڕیسـالەی ئیسـلام بـون، ڕۆلیـان هـەبوە لەپشـتگیری تـەواوی سـەرکردە ئیسلامیە سەربازی و سیاسیەکان، لەزۆر کاتدا خۆیـان ڕاسـتەوخۆ لـەناو جەنگدابون، یان لەپشتی سەرکردەکانەوە بون. سولّتانی عولەمای دروست کـردوە، زانـاو مـەردی وەك غـەزالی بەیـەکێك لەپشـتگیرو مامۆسـتای دەولـەی سـەلجوقیەکان دادەنرێـت، یـان داڕێـژەری فکـرو فەلسـەفەو ئایدۆلۆژیای ئەم دەولّەتە بو، هەروەها ڕۆلی سەرەکی هەبوە لەپوکانـەوەی باتنیە شیعەکان کـە دەولّـەتی سـەلجوقیان بـۆ مـاوەی ٤٠ سـالّ بنکـۆل کردبوو.

١- زانا ئەبو ئیسحاقی شیرازی شێخی شافیعییەکان .

٢- ئیمـامی ئـەبو حامیـدی غـەزالی یـەکێك بـوو لـە نـاودارترین مامۆستاو زانایانی خوێندنگە نیزامییەکان.

٣- عەبدول مەلیك جوەینی ناسراو بە پێشـەوای هـەردوو حـەرەم و بەدیارترین زانایانی سەردەمی سەلّجوقی دادەنرێت .

٤- عیـزی کـوڕی عەبدولسـەلام سـولّتانی زانایـان و فرۆشـیاری پادشاکان .

٥- ئـیبن ئەلهەیسـەم عـەلی حەسـەن کـوڕی هەیسـەم زانایـەك فەرهەنگێکی زانیاری عـەرەبی موسـڵمانە زانسـتی گـەورەی پێشـکەش کردووە وچەندین دانراو ونووسین ودۆزینەوەی هەیە .

٦- شـێخ ئەلئیسـلام ئـیبن جـەوزی شـەرعزانێکی حەنبەلیـە ومێژوونووس و قسەزان بووە.

٧- عومەر خەیام زانایەکی گـەردوونناس وبیرکـاریزان وشـاعیرێکی ناودار بووە.

٨- ئەلبیرۆنی توێـژەر و فەیلەسـوف و گـەردوونناس وجوگرافینـاس بووە.

٩- ئیبن حەوقەل نووسـەر و جوگرافینـاس ومێـژوونووس و بازرگـان بووە، لەدیارترین کارەکانی وێنەی زەوییە و چەندانی تر لە ئیمام و زانایان وخاوەن دانان و نووسەری بالاّ و بیرمەندی جیهانی دروست کردوە.

تەماشای ئـەم کەڵـە زانایانـە بکـە دەتـوانی بڵـێ دیـارترین زانـای سـەردەمی خۆیـان و دوای خۆیـان بوینـە، تائیسـتاش زانسـت و بـیرو فەلسەفەی ئەوانە لەجیهان دەدرەوشیتەوە وەك مەشغەلی ڕێـی و نەخشـە ڕێگایەکە بۆ هەمو گۆڕانکاری و تازەگەری و هەستانەوەیەك.

## پرۆژەی فکری خوێندنگەی نیزام پادشا لە پێشخستنی بزافی زانستی و ڕۆشنبیریدا :

ئەوەی جێگەی تێڕامانە، کە وەزیر شوێنەوارێکی ڕۆشنبیری بەجێهێشتووە کە گەواهیدەر و شاهێدی بلیمەتی و دانایی و زانیاری بەرفراوانی دەدات، گرنگترینیان کتێبی (سیاسەتنامە) یە، واتە پەڕتوکی سیاسەت. ئەمەو ئەو بزافە ڕۆشنبیرییەی کە وەزیر سەرکردایەتی دەکرد، هاوتەریب لەگەڵ بزافی سیاسی، ئابوری، پەروەردەیی، سەربازیدا، ڕۆڵی گەورە وسەرەکی بینیوە لە لەناوبردنی گێرەشێوێنی و ناکۆکی، لەولاشەوە لەدابینکردنی هێمنی و ئارامی بارودۆخەکان لە ناوچە گرنگەکانی جیهانی ئیسلامیدا.

نیزام پادشا هەر لەیەکەم ڕۆژی وەرگرتنی وەزارەتەکەیەوە پشتی بە سیاسەتی نزیککردنەوەی پیاوانی زانا و کارامە وپیاوچاکانی بەستووە، ڕۆژێك بە ئەلب ئەرسەلان دەڵێت : ئەو کات لەمامی دەترسا کە یاخی ببوو لێ ی و شۆڕشی لەدژ بەرپاکردبوو و دەیویست لەگەڵیدا بجەنگێت : (يا أيها الملك، لا تخف فإني قد استدمت لك جنداً، ما بارزوا عسكراً إلا كسروه كائنا ما كان، قال له ألب أرسلان: من هم؟، قال: جند يدعون لك وينصرونك بالتوجه في صلواتهم وخلواتهم، وهم العلماء والفقراء الصلحاء». لذا، ارتكز مشروعه الإحيائي للمذهب السني والإصلاحي لشؤون الحكم على قاعدتي الجهاد والعلم. وكان بالفعل محبا لأهل العلم والإحسان إليهم، حتى أنه خصص لـ ١٢ ألف من العلماء في مختلف أنحاء

الدولة الإسلامية رواتب ثابتة تصرف لهم بانتظام، وبالإضافة إلى ذلك كان مجلسه يضم كبار العلماء في شتى فنون العلم) [١].

واتە: ئەی خاوەن شكۆ مەترسە لەبەرئەوەی بەردەوام من كۆمەڵە سەربازێكم بۆ داناویت، لەگەڵ هەر كەسێكدا جەنگابن شكاندوویانە جا هەركەسێك بوو بن، ئەلب ئەرسەلان پێ ی ووت : ئەوانە كێن ؟، واتە: ووتی : ئەوان ئەو سەربازانەن كەنزات بۆ دەكەن وپشتیوانت دەبن وسەرت دەخەن، بەڕووكردنە خوای گەورە لەنوێژەكانیان و لەخەڵوەتەكانیاندا، ئەوانیش زانایان و هەژاران و پیاوچاكانن .

هەربۆیە پڕۆژە زیندوكردنەوەكەی بۆ مەزهەب و ڕێبازی سوننە و چاكسازیخوازیەكەی بۆ كاروباری حوكمڕانی پشتی بەهەردوو بنەمای تێگۆشان (جیهاد) و زانست بەستبوو . هەر بەڕاستی زانایانی خۆشدەویست وحەزی بەچاكەكردن بووە لەگەڵیاندا، هەتا بۆ (١٢ هەزار) لەزانایان لەناوچە جیاوازەكانی دەوڵەتی ئیسلامیدا مووچەی جێگیری بۆ تەرخان كردبوون و بەرێكوپێكی بۆی سەرف دەكردن، لەگەڵ ئەوەشدا كۆڕو دانیشتنەكان گەورە زانایانی لەهونەرە هەمەجۆرەكانی زانستدا لەخۆگرتبوو، هەروەك گرنگیدانی نیزام پادشا بەزانستە نوێگەرییەكان ئاڕاستەیەكی سەركەوتوانەی لە بڵاوكردنەوەی چاكسازی مەزهەبی وسیاسی لەجیهانی ئیسلامدا نیشاندا، لەسەردەمی نیزام پادشاوە دەستی پێكرد، جێنشینەكانی ئەو چاكسازییەیان تەواوكرد بەدرێژایی سەردەمی

[١] بروانە: الوزير السلجوقى نظام الملك رائد مؤسسة التعليم في العالم الآسلامي، الدكتور علي أجقو، قسم العلوم الآنسانية، جامعة بسكرة، مدونة الآستاذ الدكتور خليل حسن الزركاني.

دەوڵەتەکانی زەنکی و ئەیوبی ومەمالیکەکان، ئەو کاتە بەلوتکەی هەستانەوەو شۆڕشی نوێ دەژماردرا، وەدەرکەوتنی ئیمامی ئیبن تەیمیە وخوێندنگە چاکسازیە مەزنەکەی ئەو کاتە، لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا / ١٤ زایینی، هەروەك زۆرێك لە پیاوانی ڕۆشنبیر وچاکسازیخواز لەو خوێندنگە یەدا دەرچوون، ئەوانەی کە لەدوایییدا بەشداریان لەو شۆڕشی ڕۆشنبیرییەدا کرد کەوا سەلاحەدینی ئەیوبی ئەنجامیدا، بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت بەپێی ئەم زنجیرەیە پرۆژەی زیندوکردنەوەی سوننە چەند وولاتێك تێیدا بەشدارییان کردووە کە بوون و ڕەوایەتی وهێز ودەسەلاتی خۆیان بەچاکسازی کردنی جیهانی ئسلامیەوە بەستۆتەوە، پلاندارێژەری ئەم چاکسازییە یاخود ئەم پرۆگرام وبەرنامەیەش نیزام پادشایە[1].

لەسەر ئاستی گەورەترین ماملانێ ی شارستانێنی لەنێوان ئیسلام و ڕۆژئاوای مەسیحیدا، نیزام پادشا ئەندازیاری ئامادەکردنی زەمینەسازی گونجاو بووە لەڕووی ئامادەکاری و دابینکردن، هەتاوەکو موسڵمانەکان بەسەرکردایەتیکردنی سەلجوقییەکان - یەکەم شکست و شکاندنی گەورە بەسەر بیزەنتینییەکان و لەسەر خاکی خۆیاندا بهێنن، ئەوەش لە جەنگی مێژوویی (ملاژکرد) دا ( ٤٦٣ کۆچی / ١٠٧١ زایینی)، ئەو سەرکەوتنە گەورەیەش ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ دروست بوونی دەوڵەتی عوسمانی - دوای دوو سەدە - ئەویش بەکردنەوەی دەرگا بۆ نیشتەجێ کردنی تورکە موسڵمانەکان لەئاسیای ناوەڕاست، هەروەها ئەوەش زەمین لەرزەیەکی

---

[1] بروانە: حسب مؤرخ نظم الحكم القلقشندي ( ت ٨٢١ هـ / ١٤١٨ م ) الذي يقول في صبح الآعشى.

بەهێز و شـۆکهێنەر بـوو بـۆ جیهـانی ئـەورووپی کـە بـەدوای خۆیـدا - لەچوارچـێوەی هۆکارەکـانی تـردا - جـەنگی خـاچ پەرسـتی ڕاگەیانـد وبەهۆیەوە کەناراوەکانی شامیان بەدرێژایی دوو سـەدە داگیرکـرد . بـەڵام ئەوە سەلاحەدین بوو کە یەکەم بزماری لـە تـابووتی ئـەو داگیرکەرانـە دا ئەویش بەسەرکەوتنی گـەورەی لەجـەنگی (**حطـين**)دا لەسـاڵی ( ٥٨٣ کۆچی / ١١٨٧ زایینی) و بەدوای ئەویشدا ئازادکردنی مزگەوتی ئەقصـا هات [1].

---

[1] نظام الملك يمهد لمقدم العثمانيين بأنتصار ملاذكرد و صلاح الدين يفكك الدولة العميقة للفاطميين، تعرف على أهم وزراء الاصلاح، عبدالله الطحاوي. https: \\ www. Aljazeera.net \ author .

## ڕۆڵی نیزام پادشا لەبواری فکری و یەکلاکردنەوەی ململانیکاندا

ژیان لەسەرەتای دەست پی کردنیەوە تا ئەمڕۆ لەململانیـەکی قـوڵ دایە، سـەرەتا لـەنێوان باوکـە ئـادەم و شـەیتان، دواتـر ئـەم ململانییـە دەگوازرێتـەوە بـۆ سـەر زەوی بـۆ نێـوان مرۆڤـەکان، خـودای گـەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ٣٦﴾ البقرة: ٣٦.

ئەم ململانێیە فکریە درێژە دەکێشـێت لەگـەڵ درێـژە پێـدانی ژیـانی مرۆڤ لەنیوان فکری حەق و باتل، لـەدوا هـاتنی پێغەمبـەر (صـلی اللـە علیە وسـلم) ئـەم ململانێیـە فکریـە دەگوازرێتـەوە بـۆ بازنەیـەکی زۆر فراوانتر، بەهۆی ئەوەی ڕیسـالەی ئیسـلام ڕیسـالەیەکی جیهانیـە لەگـەڵ تەواوی فکرە لادەرو گۆڕاوەکان دەکەوێتە ململانی، لەهەندی قۆناغ فکری دەرەکی ناتوانی بەرامبەر فکری ئیسـلامی بوەسـتێتەوە، بەناچـاری پـەنا دەبەنـە بـەر دروسـت کردنـی فکـری نـاوەکی، وەك فکـری باتنیـەکان کەهەڵگری فکری شیعەکانن، لەسەردەمی نیزام پاشا و دەوڵەتی عەباسـی بەدیاری کراوی لەسەردەمی دەوڵەی سەلجوقی، خۆیان خزاندە ناو دەوڵەت، زیاتر لە٤٠ ساڵ زۆربەی جومگەکانی دەوڵـەتیان کـۆنترۆل کـرد، لێـرەوە ڕۆلی زانای ئایینی دەست پیّ دەکات بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەم فکرە ناوەکیە لادەرانە، نیزام پادشا بەزیرەکی و لێهـاتویی خـۆی لـەڕێی دروسـتکردنی

قوتابخانەی نیزامــی و پێگەیانـدنی زانایــان و دانــانی مەنهــەجی ئــەهلی سونە، توانی ڕوبەڕوی ئەم مەنهەجە لادەرە ببێتەوە، لەڕوی فکریــەوە بــی بوکێنیتەوە. لەحاڵی ئێستای جیهــانی ئیســلامی جــارێکی تــر پێویســتە لەسەر زانایان هەنگاوی جدی بنــێن، دوو بنــەمای ئەساســی بــۆ ئومــەت دابڕێژنەوە.

بنــەمای یەکــەم: وەحــدەی فکــری بــۆ ئومــەت دروســت بکــەن، پەرتەوازەیی و پارچــە پارچــەیی و بــەرت و بــلاَوی فکــری زۆر تەشــەنەی کردوە لەنیو موسڵمانان، یەکڕیزی و یەك هەڵوێستی و یەکفرەیی لــەنیوان موسڵمانان لاواز بوە، هۆکارەکەشی پەرتــەوازە فکریەکەیــە بــەهۆی لادان لەفکری ئەهلی سونەت، بــەواتا شارســتانیەکەی نــەك بەواتــە ســعودی و سەلەفیەتە سەردەمیەکە، ئەمەش بەگێڕانەوەی ئومەت بــۆ ســەر ئــەهلی سونەت بون چارەسەر دەبێت، بەدەست گرتن بەئەهلی ســونەت، واتــە دور کەوتنەوە لەفکرە دروستکراوەکانی وەك فاتمی و شیعەو ئەوانی تر دروست دەبێت، لەبەرامبەردا دور کەوتنەوە لەخیلافاتی فکری، کەمن نــاوم نــاوە فقهی عەقیدە، وەك فکری ئەشعەری و ماترودی و فکــرە ئیســلامیەکانی تر، کەهەمویان لەچوارچیوەی ئیختلافــی فکــری ئــەهللی ســونەن و لــەم چوارچیوەیە دەرناچن، بۆیە فقهی عەقیدەیــە چــونکە فکــری موســلمانانە لەسەر وەسفیەتی ئەسمائو سیفاتی خودا، نــەك دەق و شــەرع بێــت، هــەر تیڕوانینێك بۆ دەقی قورئان و ســونەت مــادام لەلایــەن مرۆڤــەوە بێــت و تێگەیشتنی مرۆڤــەکان بێــت نابێتــە دیــن، بــەڵکو دەبێتــە تێگەیشــتنی موسلمانان لەدین، نــابی ئەوانــە ببنــە هــۆی پــەرت بــونی موســلمانان و لێکترازانی وەحدەی فکری، پێشی ئێمە زانایان ئەم خیلافاتــە فکریانــەیان

هەبوە لەچوارچیوەی ئەهلی سوونە، نەبۆتە پارچە پارچە بونیان، ئێستاش پێویستمان بەهەمان تێگەیشتنە.

بابەتی دووەم: وەحدەی کۆمەڵایەتی، ئیسلام سیستەمی وای داناوە بۆ ڕێکخستنی تاکەکانی کۆمەڵگاو لێك نزیك بونیان، لەگەڵ هاوسۆزی و هاوخەمی و دۆستایەتی، بۆ ئەم مەبەستە بواری عیبادەت و خواپەرستی بەسیستەمی فیقهی ڕێکخستوە، تاتاکەکان بەهەمان شێوە خواپەرستی بکەن، لێك نزیك بن و لەدروشم و بابەتە ئیسلامیەکان هاو هەڵوێست بن، بۆ زەرورەتی ئەم لێك نزیك بونەوەو یەك جەستەیی ئومەت، مەزهەبی زانایانی موعتەبەریان کردۆتە بنەمای ژیان و وەحدەتی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی لەسەردەمی دەولەی عەباسی، کاتێك قازی ئەبو یوسف دەبێتە قازی دەوڵەت، مادە فقهیەکان وەك مادەی یاسایی تەقنین دەکات و دەیانکاتە بنەمای خواپەرستی، لەنیو کۆمەڵگاو وەك یاسای ئاینی رۆژانەی موسلمانان کاری پێ دەکرێت، ئەمەش لەجیهانی ئیسلامی وەحدەی کۆمەڵایەتی پێ دەپارێزرێت، ئێستا هەر نامیلکەی سعودی و فکری هەندی بەناو سەلەفی سەردەم هاتۆتە نیو موسڵمانان و وەحدەی فکری لاواز کردوە، هەر مزگەوت و تاکێك بەفەتواو حوکمێکی تایبەت کار دەکات، تاوای لێ هاتوە لەلایەك بەهۆکاری ململانیی فیقهی عەقیدە پارچە بوینەو لێك ترازاوین، لەولاشەوە بەهۆی نەبونی وەحدەی کۆمەڵایەتی هەر کەسەو بۆتە خاوەنی فەتوای تایبەت و ئاراستەی بەلایەکی تر داڕۆیشتوە، ناو مزگەوت و خواپەرستی کەلێنی زۆری تێکەوتوە، تا گەیشتۆتە ئەوەی عامەی خەڵك بڵێت مەلایەکان سەریان لەئێمە شیواندوە، نازانین بەفەتوای کێ بکەین، بەتایبەتی لەسەردەمی سۆشیال میدیاو فیس بوك، هەر مەلایەك و مینبەری تایبەتی خۆی

هەیە، بەبی ئەوەی لیّی بزانی و تەماشی لێکەوتەکانی بکات، حوکمێک لەنامیلکەو زانایەکی سعودی وەردەگرێت و فریدەداتە ناو کۆمەڵگا، ئایە ئەمە بۆ کۆمەڵگا باشە یان نا؟ وە هەر کەسەو ناوی دەنێت ئەوەی من قورئان و سونەتە، ئەوی تر نا. بۆیە گەڕانەوە بۆ جارێکی تر هەنگاو نان بۆ دروست کردنی وەحدەی فکری و وەحدەی کۆمەلأیەتی زەرورەتی ئیستای ئومەتەو واجبی سەر شانی زانایانی ئاینیە.

## ڕۆڵی زانای ئاینی خواناس نیزام پادشا لەبواری سیاسەت.

پەیامە ئاسمانیەکان و پیغەمبەران سەلامی خودایان لی بیت هاتون بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی خەڵك و ئیدارە دانی سیاسی و کۆمەلآیەتی و ئابوری و بەشەکانی تری ژیان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ، كُلَّما هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وإنَّه لا نَبِيَّ بَعْدِي، وَسَتَكُونُ خُلَفَاءُ فَتَكْثُرُ، قالوا: فَما تَأْمُرُنَا؟ قالَ: فُوا بِبَيْعَةِ الأوَّلِ، فَالأوَّلِ، وَأَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فإنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ)[1].

بەتایبەتی ئیسلام دینێکی گشتگیرو هەمەلایەن و کاملە، دین و دەوڵەت و روح و لاشەو سیاسەت و حوکم و نەقلێ و عەقڵە، بۆیە ناکریت زانایان کەمیراتگری پێغەمبەرانن پشت لەسیاسەت بکەن و تەنها کاریان وەعزو ئامۆژگاری بێت، فکری عەلمانی بەوتەی خۆیان بلاو بکەنەوە کەدەلێین جیاکردنەوەی دین لەدەوڵەت و ژیان پەیرەو بکەن و بەبێ ئاگاداری خۆیان ببنە بەشێك لەجێ بەجێ کاری عەلمانیەت، بانگخوازی و دروشمی ئیسلامی بەبێ بەهێز کردنی سیاسەت لەمحال دەچێت، سەرکردەی سیاسی بەبێ پالپشتی زانایانی ئایینی لاسەنگەو لارو ناتەواوە، بۆیە نیزام پادشا لەیەك کاتیدا زاناو خواناس و مامۆستای مەدرەسەو دانەری مەنهەجی شەرعی بو، لەهەمان کاتدا سیاسی و شارەزا بو لەکارو باری

[1] بروانە: صحیحی بوخاری، ژمارە (٣٤٥٥)، ومسلم، بەژمارە، (١٨٤٢).

سیاسەت، سەرکردە ئەلب ئەرسەلان بەبی گەڕانەوە بۆ ئەم زانا بەڕێزە بەهیچ شێوەیەك هەنگاوی سیاسی نەدەنا، بۆیە مێژونوسان دەڵێن سەرکەوتنەکانی ئەلب ئەرسەلان و مەلیك شا بەهۆی زیرەکی و لێزانی و ساسەتمەداری و دبلۆماسی نیزام پادشا بوە، وەزیری هەرە گەورەی دەوڵەت بوە، بەهۆی شارەزایی سیاسی بۆتە مەرجەعی سیاسەت کردن بۆ سەرکردەکان، لەهەمان کاتدا دانەبڕاوە لەئیدارەدانی مەدرەسەو پێگەیاندنی زاناو بیرمەندان، لەولاشەوە خەریکی پێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی گەروە بوە، سیاسەت نامەی وەك بنەمایەکی سیاسی داناوە، ئەمڕۆ پێی دەڵێن زانستی سیاسی. کەواتە زانایان نابی لەسیاسەتی ڕاست و دروست دابڕێین. بەناوی ئەوەی من زانای ئاینیم حەقم بەسیاسەتەوە نیە! ئەمە گەورەترین هەڵەی ستاراتیژی و سیاسی و دەعەوی و شەرعیە، نابی زانا بیکات. ئەم بۆچونە خزمەت بەعەلمانیەکان دەکات. زانای خواناس لەبورای سیاسەت کردن لەپێشەنگ بوە.

## زانای ئاینی و پێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی.

لەڕومالّی ژیــانی سیاســی و فکــری و دینــداری نیــزام پادشــا بۆمــان دەردەکەوێت پێگەیاندنی سەرکردە پرۆسەیەکی هەمەلایــەن و درێژخایەنــە پێویستی بەم هەنگاوانە هەیە.

١-بنەمای پێگەیاندنی سەرکردە فکــرە، هــەر لەســەرەتاوە پێویســتە ئەوانەی پێیان دەگەینی هەڵگری فکر بن، هەرتاکێك هەڵگری فکر نەبێت تاسەر بەردەوام نابێت و بەرگری لەقەزیەی ئومەت ناکات.

٢-هەڵبژرادن و دیاری کردنــی تــاکی شــیاو بــۆ ســەرکردەی سیاســی مەرجی سەرەکیە.

٣-دانانی مەنهەجی ڕیسالی و هــەڵگری پــەیام، هــیچ ســەرکردەیەك پێناگات بەبێ مەنهەجی ڕیسالی، لەئێستادا مەنهەجەکان زیــاتر لایــەنی زانستی ڕوتن بەبێ ڕیساڵە، بۆیە وەك پێشەو کارێکی پیشــەیی زانــا پــێ دەگات، نەك سەرکردە.

٤-هەڵگرتنی قەزیەی ئومەت، خاڵی سەرەکی پێگەیاندنی تاکە، هەر تاکێك هەر لەسەرەتاوە پێویســتی بــەوەی هەیــە لەســەر قەزیــەی ئومــە پەروەردە بکرێت .

٥-مامۆســتاو زانــای خــاوەن فکــر بکرێنــە وانــە بیــژ لەقوتابخانــەی پێگەیاندنی سەرکردە.

٦-دابین کردنی ژینگەی فکری و زانستی بۆ تاکی پێگەیندراو.

٧-کردنەوەی قوتابخانەی تایبەت بەپێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی.

٨-دابین کردنی ژیانی زاناو قوتابیان لەروی مادی و ژینگەیی و سایکۆلۆژیەوە.

٩-دیدگای تەحیدی شارستانی بکرێتە ئەساس بۆ پێگەیاندن، واتە شیکردنەوەی پەیوەندی مرۆڤەکان بەخوداو خەڵك و گەردون.

١٠-دیاری کردنی وەزیفەی سەرەکی پێگەیاندکارەکان کەوەزیفەی جێنشینایەتی و خواپەرستی و ئاوەدانکردنەوەیە.

١١- خواناسی بکرێتە بنەمای سەرەکی بۆ خۆڕاگری و دڵسۆزی و کۆڵنەدان و نەبەزین .

ئەم خاڵانە دیارترین سیماو بنەمای پێگەیاندنی سەرکردەیە لەمەدرەسەی نیزام پادشا. ئەمرۆش پیویستمان بەهەمان فکرەو مەدرەسەو پێگەیاندنی زانایانی سەرکردەو سیاسیە.

## دەستکەوتە گەورەو گرنگەکانی زانای خواناس و سیاسی نیزام پادشا

کۆی ئەم سەرکەوتنانەی لەپێشدا باسمان کرد لەئینجازاتەکانی زانای خواناس نیزام پادشا بون، بەچەند خاڵێك بوختیان دەکەینەوە:

بەبەهێزترین وەزیر دەژمێردرێت لەمێژوی ئیسلامی، بەهەمان شێوە سەرکەوتوترین وەزیر بوە لەدەولەی سەلجوقی.

وەك زانایەکی ئاینی، وەك ڕابەرو چاوساغی ئیدارەدانی دەولەتی سەلجوقی دەژمێردرێت.

گەورەترین قوتابخانەی دامەزراندن بەناوی قوتابخانەی نیزامـی، لەدواییـدا بەهەمو جیهان بلاۆ بۆوە.

زۆرترین خزمەتی ڕێبازی سونی کرد و فکری باتنی حەشاشیەکانی کۆتایی پێ هێنا، مەترسی بون لەجیهانی ئیسلامی.

دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی ئـەو زۆرتـرین سـەرکەوتنی تۆمـار کـردو فراوان بو.

گەورەترین زانا لەسەردەمی ئەودا لەمەدرەسەی نیزامی پێگەیشت.

زانایەکی ئاینی بەوشیارترین و شارەزاترین سەرکردەی سیاسـی دەناسریت .

گەورەترین خزمەتی سونەی کرد لەزەمەنی وەزیرایەتی.

ڕێزی بێ پایانی بۆ زانایانی ئاینی گێڕاوە بەپاڵپشتی دەوڵەت.

سیاسەت و خواناسـی و دەوڵەتـداری و مەنهـەجی خوینـدن و فکری تێگەڵ کرد، ئیسـلامیکی جـوانی پێشـکەش بـەجیهان کرد.

# ناسنامەو پێگەی زانای ئاینی و کەسایەتی زانستی و فکری زانای ژیر و وشیار (ئاق شەمسەدین)

## دەروازەی ناسین:

هەندێ ڕوداو لەمێژوودا ڕویانداوە، تامرۆڤایەتی مابی گاریگەری و ئاسەواری ئەرێنی بەسەر پرۆسەی فکری و سیاسی هەر دەمینی، هەروەها وەك فەخرو شانازی بۆ ئومەتی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ماوەتەوە، ڕێڕەوی مێژوی گۆڕیوەو بۆتە هۆکار بو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی موسڵمانان، یەکێك لەم ڕوداوە مێژووییانە فەتحی قوستەنتینییە، کەوەك دوانەیەك لەگەڵ ناوو نازناوی زانای پایەبەرز ئاق شەمسەدین لێك جیاناکرێتەوە. کەناوی فەتحی قوستەنتینیە دێت ناوی محمدی فاتیح لکاوە پێی، لەپشتی ئەم سەرکردە سیاسی و سەربازیەش ناوی پێگەینەرو مامۆستاو زانای پایەبەرز ئاق شەمسەدین دێت، بۆ زیاتر بەرچاو ڕونی و شارەزا بون و ڕوڵی زانایان لەمێژوی فتوحات و سەرکەوتنەکانی جیهانی ئیسلامی، بۆ سود وەرگرتن لەڕیبازی پێگەیاندنی سەرکردەی فکری سیاسی و ناسینی زانای مەرد ئاق شەمسدینمان هەڵبژارد، کەمێك لەفکرو پەیڕەوی پێگەیاندن و تواناوی قیادی بخەینە بەردەستی ئەوانەی دەیانەوی بزانن زانایان چەندە ڕۆڵی کاریگەریان هەبوە لەمێژوی فتوحات و سەرکەوتنەکان.

## ناسنامەی زانای پایەبەرز مامۆستا ئاق شەمسەدین

ناوی محمدی کوڕی شەمسەدینی کوڕی حەمزەیە، لەساڵی ٧٩٢ی هجری بەرامبەر ١٣٨٩ی زاینی لەدیمەشق لەدایك بوە، نەسەبی دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئیمامی ئەبوبکر صدیق، لەساڵی ١٤٢٩زاینی کۆچی دوای کردوە، لەحەوت ساڵی هەمو قورئانی لەبەر کردوە، لەقوتابخانەکانی دیمەشق دواتر لەحەلەب و ئەنقرە زانستەکانی تری تەواو کردوە.

ئاق شەمسەدین زانا و مامۆستاو تێکۆشەر (موجاهید)، ئەو پیاوەی کە (محەمەد فاتیحی) پەروەردەکردووە خاوەنی مزگێنی و ئازادکەری قوستەنتینییە، شێخ ئاق شەمسەدین بەیەکێك لەگەورەترین زانایانی دەوڵەتی عوسمانی دادەنرێت، مێژوونووسان ئەو بە ئازادکەری ڕاستەقینە وحەقیقی قوستەنتینییە دادەنێن، لەبەرئەوەی هەمیشە و بەردەوام خوێندکارەکەی پەرۆشکردووە و هانیداوە تا شاری قوستەنتینیە ئازاد بکات، خودا لیّ ی خۆش بێت چەندین هەڵوێستی گەورەو مەزنی هەبووە لەپەروەردەکردن و تێکۆشان (جیهاد) و زانستدا، ڕزگارکردنی قوستەنتینییە بەیەکێك لە ڕوداوە مێژووییە مەزنەکان دادەنرێت کەوا لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ڕوویداوە، پەردەی لەسەر ئیمپڕاتۆڕیەتی بیزەنتیدا دادرایەوە، کە بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ بەردەوام بوو (لەسەدەی چوارەوە تا سەدەی چواردەی زایینی)، هەروەك هەندێکیش بە بەروارێك بۆ کۆتای هاتنی سەدەکانی ناوەڕاست لەئەوروپا و، سەرەتا ودەستپێکی سەدەی شۆڕش وپێشکەوتنی دادەنێن. وە لەڕوانگەی شارستانێتی ئیسلامیەوە ئازادکردنی قوستەنتینییە بەهەمان شێوە بە یەکێك لەڕووداوە گەورەکان

دادەنرێت لەمێژووی ئیسلامیدا، وەك هاتنە دی موژدە و مزگێنییەکی پێغەمبەر (صلى الله عليەوسلم ) هاتووە، وەك لەفەرموودەکەدا هاتووە لەعەبدولاَی کوڕی بشری ئەلغەثعمی: (ڕەزای خوای لەسەر بێت) لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەر (صلى اللە عليەوسلم) بووە فەرموویەتی: (لَتُفْتَحَنّ القُسطَنْطِينِيّةُ فلنعمَ الأميرُ أميرُها ولنعمَ الجيشُ ذلك الجيش)[1].

واتە: ( بەدڵنیاییەوە قوستەنتینییە ئازاد دەکەن، ئەو پێشەوایەی ئەو کارە دەکات باشترین پێشەوایەو ئەو سوپایەش باشترین سوپایە)، دەڵێت: مسلمەی کوڕی عەبدولمەلیك بانگی کردم وپرسیاری لێکردم منیش بۆم باسکرد وئەویش هێرشی کردە سەر قوستەنتینییە.

هەربۆیە فەرمانڕەواو پێشەوایان بەردەوام و یەك لەدوای یەك سوپایان دەنارد لەپێناو بەدیهێنانی ئەو موژدە ومزگێنیە، وە دەستختنی شکۆی ئازادکردنەکە، هەتا ئەو کارە لەسەر دەستی سەرکردەی عوسمانی سوڵتان محەمەد خانی دووەم کە ناسراوە بە (سوڵتان فاتیح) بەدیهات، چەندین توێژینەوەش هەن لەڕێگەی لێکۆڵینەوەو شیکارکردنەوە باس لە ژیانی ئازادکەران وسەرکردە سەربازییەکان دەکەن، لەگەڵ ئەوەی لەپشت ئەم سەرکردانەوە زانا و پەروەردشیارانێك هەبوون کەوا ڕێگەیان بۆ

(١) ئەم فەرمودەیە ئیمامی بوخاری تاریخ الکبیر هیناویەتی بەژمارە، ١٧٦٠، ج٢-ص٨١، هەروەها لەمسندی ئیمام احمد و ئیبن حەبان و حاکم دا هاتوە، دەلین ئیسنادەکەی بەهیزە، شەواهیدی زۆر هەیە لەسەر بەهیزی ئەم فەرمودەیەکە صەحیحە. وەفەتحی قوستەنتینیە کرا گەورەترین بەلگەیە لەسەر ڕاستی و دروستی ئەم فەرمودیە.

ئازادكردنەكانیان خۆشدەكرد، لەپلاندانان و جێبەجێكردن و كۆكردنەوەی سوپاكاندا بەژداریان دەكرد لەگەڵیاندا، بەڵام ئەم لێكۆڵینەوانە ڕۆڵی هەندێك لەو زانایانە پشتگوێ خستووە وەك ئاق شەمسەدین، یاخود ئاماژەیان پێداون بەبێ ئەوەی مافی خۆیانیان پێ بدەن، لەگەڵ پێویستی تێگەیشتن لەم ڕۆڵەو درككردن بەو توانا زانستی وتایبەتمەندیە دەروونی وفیكریانەی كە هەیانبووە، هەروەها میكانیزمەكانی كاریگەرییان لە نێو كۆمەڵگاكاندا لەسەر ئاستی سەركردە و كۆمەڵگادا .

## پرۆگرامی پەروەردەیی زانا خواناس و ڕەبانییەکان بۆ دروستکردنی کەسایەتی سەرکردە محەمەد فاتیح.

محەمــەد فــاتیح لەلایــەن دوو زانــای خوانــاس وڕەبانیــەوە پــەروەردە وگەورەکراوە، گەورەترین کاریگەریان لەسەر دروستکردنی کەسایەتی ئەو سەرکردەیەدا هەبووە ئەوانیش :

## زانا ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیل گۆرانی کوردی

زانای پایەبەرزی کورد مامۆستا گـۆرانی کـوردی زانایــەکی کـورد بـــوە، سەرپەرشـــتی لەبـــەرکردنی قورئـــان وخوێندنـــەوەی پەڕتوکـــە شەرعییەکانی محەمەد فـاتحی دەکـرد، و محەمــەدی لەســەر بەگــەورەزانین وشکۆدارکردنی فەرمانەکانی خودا وپابەندبوون بەســنوورەکانی شــەریعەت و لەخوداترساو وچاکسازیەوە پەروەردە دەکرد، ئەمەو ئــەم پەروەردشــیارە بەرِێزە چاکەکارە فەرمانی سوڵتانی دەدرِانــد ئەگــەر شــتێکی پێچــەوانەی شەرعی تێدا بەدی بکردایە، بۆ سوڵتان نەدەچەمایەوە و ڕاستەوخۆ بەناوی خۆیەو ووتوێژی لەگەڵ دەکرد وتەوقەی لەگەڵدا دەکرد ودەستیشــی مــاچ نەدەکرد، بۆیە کاریگەری ئەو پەروەردە ڕاست و دروســتە لەســەر محەمــەد فاتیح دەبینرێت کاتێك دەسەڵات دەگرێتە دەست، ئەو شــەرع و زانایــانی ئایینی و، خەڵکانی خۆپارێز لەتاوان و لەخواترساوانی بەگــەورە زانیــوە و ڕێزی لێگرتوون .

**محەمەد** فاتیح زانایان و پیاوچاکان دەکاتە دەست وپێوەند وجێگە ڕاز ونهێنی وکەسە تایبەت ونزیکەکانی خۆی، ونەریتێکی هەبووە لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، لەدوای نوێژی نیوەڕوان دانیشتنێکی ساز دەکردو زانایانی زۆر شارەزاو قووڵبوەوە لە زانستی شرۆڤە وڕاقەکردنی قورئانی پیرۆز تێیدا بەژدارییان دەکرد، هەر ڕۆژەو یەکێکیان چەند ئایەتێکیان شرۆڤە وڕاڤە دەکرد وزاناکانی تر ووتووێژیان لەگەڵدا دەکرد و فاتیحیش بەژداری دەکرد لەگەڵیاندا[1].

---

[1] بروانە: کیف تعد قائدا ربانیا محمد الفاتح نموذجا،: رنیم أبو شامات، https :// www.annajah.net .

## مامۆستای دووەم بریتیە لە شێخ و زانای گەورە محەمەدی کوڕی هەمزە ئەلڕوحیە ناسراوە بە شێخ (ئاق شەمسەدین).

ئەم شێخ و مامۆستا گەورە ومەزنە گەورەترین کاریگەری لەسەر ژیانی سەرکردە محەمەد فاتیح هەبووە، بەشێوەیەك كە لەسەر دوو کاری گەورە پەروەردەی کردوە:

١- زیادکردن و دوو هێندەکردنی بزافی جیهادی عوسمانیەکان.

٢- هەر لەتەمەنێکی منداڵیەوە ئیلهام پێدانی ئەوەی ئەو - ئەو شازادە وپێشەوایەیە کەپێغەمبەر(صلی الله علیەوسلم) لەفەرمودەکەیدا باسی لێوە دەکات، دەفەرموێت: (لَتُفْتَحَنّ القُسطَنْطِينِيّةُ فلنعمَ الأميرُ أميرُها ولنعمَ الجيشُ ذلك الجيش) [١].

واتە : ( بەدڵنیاییەوە قوستەنتینییە ئازاد دەکەن، ئەو پێشەوایەی ئەو کارە دەکات باشترین پێشەوایەو باشترین سوپاش ئەو سوپایەیە).

تا بیرو هزری محەمەد پڕ بێت لەوەی کەئەو فەرموودەیە مەبەستی لەوە، یەکەم شتێکیش دوای گرتنەدەستی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتیەکەی ئەوەبوو کەوا خۆی بۆ ئازادکردنی قوستەنتینیە ئامادە بکات، هەرواشی کرد و ڕوویدا، هەتا مێژوونوسانیش دەڵێن کە

---

[١] ئیمام أحمد والحاكم گێراویانەوە.

شێخ ئاق شەمسەدین ئەو ئازادکەری ڕاستەقینە وحەقیقی قوستەنتینیە یە .

٣- هەر ئەویش بوو کە محەمەد فاتحی فێری زانستەکانی بیرکاری وگەردونناسی ومێژوو وشێوازەکانی جەنگ کردووە.

٤- هەر لەگەنجیەوە وانەیەکی فێری محەمەد فاتیح کردووە کە هەرگیز لەبیری نەکردووە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم مامۆستا گەورەیە تا چ ڕادەیەك لەمانای دەرچوون و پەروەردەکردنی سەرکردەیەکی خواناس و ڕەبانی تێگەیشتووە، ڕۆژێك فاتیح بانگ دەکات و دواتر بەبێ هیچ هۆکارێك بەتوندی لێی دەدا و، ئەویش زۆر دەگری، بەردەوامیش ئەو ڕووداوەی لەبیر بووە ولەبیری نەکردووە، تەنانەت کاتێکیش لەسەردەمی مورادی باوکیدا دەسەڵات دەگرێتە دەست، شێخەکەی ئاق شەمسەدین بانگ دەکات و زۆر بەتوڕەییەوە لێ ی دەپرسێت: ( بۆچی لەو ڕۆژەدا لێتدام؟ کە شتێکی وام نەکردبوو شایەنی ئەوەبم لێم بدرێت؟) شێخەکەی پێ ی ووت : (وویستم فێرت بکەم تامی ستەم لێکردن چۆنە؟ و کەسی ستەم لێکراو چۆن دەخەوێت؟ هەتا گەر دەسەڵاتیش بگریتە دەست ستەم لەکەس مەکە)، فاتیح هیچی بۆ نەمایەوە تەنیا داوای لێبوردن کردن لە شێخەکەی نەبێت وسەر و دەستی ماچ کرد .

٥- کاتێك فاتیح دوای ئازادکردنی قوستەنتینیە وویستی واز لەدەسەڵات بهێنێت و خۆی کەنارگیر بکات، خۆی بۆ پەرستنی خودا تەرخان بکات، پرس وڕاوێژی بە شێخ ئاق شەمسەدین کرد، ئەویش پێ ی ووت : تۆ ئەگەر بچیتە نێو خەڵوت و تەنیاییەوە هەست بەچێژێك دەکەیت ئەوکات دەسەڵاتت لەبەر چاو دەکەوێت و کاروبارەکانی تێك

دەچێت، ئەوەی تۆ تێیدایت باشترە لەوەی کەبچیتە نێو خەڵوەت وخودا پەرستیەوە، ئەمەش تێگەیشتنێکی گەورەیە لەم پەروەرشیارە چاکەوە .

بەم شێوەیە ئەم زانا خواناسە ڕەبانیە خوێندکارە جوامێرەکەی پەروەردە کرد، هەتا لەسەر مانا و واتایەکی گەورە سەرکردایەتی بکات، پەیوەستی کردۆتەوە بە ئامانجێکی بەرزترەوە کە هەوڵی بۆ دەدات و هەموو توانایەکی خۆی بۆ دەخاتەگەڕ، بەدڵنیاییەوە ئەوەش لەبەرژەوەندی هەموو ئومەتە [1].

[1] بڕوانە: قضية القيادة الربانية : قرأة في فكر القائد رباني . كيف تعد قائدا ربانيا - محمد الفاتح، نموذجا، المؤلف: رنيم أبو شامات، https :// .www.annajah.net

## هەوڵەکانی شێخ ئاق شەمسەدین لەپەروەردە وفێرکردنی سوڵتان محەمەد فاتیح وهەوڵەکانی لەئازادکردنی قوستەنتینیەدا.

لەو بابەتانەی کە پێویستی بەئاشکراکردن و ڕوونکردنەوە هەیە ئەوەیە کە پەیوەندی بە کەسایەتی شێخ ئاق شەمسەدینەوە هەیە لەلایەنی پەروەردەیی و ڕۆشنبیریەوە :

١- ئاق شەمسەدین مامۆستا وپەروەرشیار وڕابەر و چاکسازێکی کۆمەڵایەتی بوو بۆ دروستکردنی کەسایەتی محەمەد فاتیح، سەرپەرشتی پەروەردەکردن وفێرکردنی سوڵتان محەمەدی دووەمی کردووە، وای لێکرد سەرکردەیەکی گەورەو مەزنی لێدەربچێت و هانیدا بەرەو ئازادکردنی قوستەنتینیە .

٢- ئەو لەجیهاددا هاوبەشی کرد لەگەڵیدا و، لەگەڵیدا وەستا تا هاوکاری بکات وپشتیوانی لە هەڵوێستەکەی کرد تا ئازادکردنەکە ئەنجامدرا وتەواو بوو، شێخ ئاق شەمسەدین بەیەکێك لەگەورەترین زانایانی دەوڵەتی عوسمانی دادەنرێت و، مێژوونووسان بەئازادکەری ڕاستەقینەو حەقیقی قوستەنتینیەی دادەنێن، لەبەرئەوەی هەمیشە خوێندکارەکەی پەرۆش دەکرد و هانیدەدا تا ئازادی بکات .

## هەڵوێستێکی گەورە

ئاق شەمسەدین (خودا لیٚ ی خۆش بێت) چەندین هەڵوێستی گـەورەی لەپـەروەردە وجیهـاد وزانسـتدا هـەبوو، هێنـدەی بەسـە کـە ئامـاژە بەهەڵوێسـتەکەی بـدەین لـەڕۆژی قوسـتەنتینیەدا، کاتێـك موسـڵمانان گەمارۆی قوستەنتینیەیان دابوو و نەیاندەتوانی دەروازەکەی بـبڕن وبچـنە ژوورەوە، سوڵتان محەمەد فاتیح دونیای لیٚ هاتبووەوە یەك و جیهانی لەلا بەر تەسك ببوەوە، ئەو کات بەدوای شـێخ ئـاق شەمسـەدین دا دەگـەرا، لەسوجدەدا بینی زەلیلانە دەگریا و لـە خـودای گـەورە دەپاڕایـەوە، تـا موسڵمانان سەربخات وعەمامەکەشی لەسەری کـەوتبووە خـوارەوە، بۆیـە محەمەد فاتیح ئەوە خۆشحاڵ وشادومانی کرد وگەڕایـەوە نێـو سـوپاکەی، ئیدی هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کـە موسـڵمانان توانیویانـە دەلاقەیـەکی قوستەنتینیە ببڕن، سوڵتان شادومانی خۆی دەربـڕی و الله أکبـەری کـرد. ووتی سوێند بەخودا خۆشبەختی من بەهەبوونی ئاق شەمسـەدینە لـەنێو سوپای موسڵماناندا، لەسەرجەم خۆشیەکانی تر گـەورەترە، بـە هـەبوونی کەسانی وەك ئەوەوەیە کە سەرکەوتنی ئاسمان دادەبەزێت.

## چۆنیەتی سوود بینین لەپرۆگرامی پەروەردەیی شێخ ئاق شەمسەدین بۆ دروستکردنی سەرکردە لەرۆژگاری ئەمرۆماندا :

وەك پێشتر باسمان کرد لەپرۆژەی پیگەیاندن و دروستکردنی سەرکردە محەمەد فاتیح لەسەر دەستی ئاق شەمسەدین چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێت :

١- ئامادەکردنی سەرکردەی خواناس ورەبانی بابەتێکی خۆرسك نیە و بۆ قەزاو قەدەری خوایی جێبهێلرێت، بەبێ هیچ پلاندانانێك ورەچاوکردنی هۆکارەکان، یاخود بابەتی بلیمەتی تاکە کەسی وکەسی بێت، بۆ کەسێك بەتەنیا بۆ خۆی دەچێتە نێو ریزەکانەوە تا دەگاتە کورسی دەسەلات وسەرکردایەتیکردن . بەلکو پرۆسەیەکی سەخت و درێژخایەنە ولەتەمەنی منداڵیەوە دەست پێدەکات بۆ گەشەپێکردن وئاشکراکردنی کارامەییەکان و بەهێزکردن وپتەوکردنی تواناکان، لە پرۆسەیەکی یەك لەدوای یەکدا بۆ پێگەیاندن وپەروەردەکردنی سەرکردە خوازراوەکەدا .

٢- ئەم ئامادەکارییە تەنها لایەنی ئایینی و رێگر وبەربەستی بیروباوەریدا کورت نەکراوەتەوە، بەلکو پرۆسەیەکی بنیاتنانی تەواوە بۆ سەرکردەیەك کە فەرمانرەوایەتی ئومەتێك دەکات، ئومەتێ: بۆ خۆی دەژێت و، پێویستی بەکەسێکە ژیانی بۆ چاك بکات، هەروەها ئەو

دونیایەشی بۆ بپارێزێت کەوا پڕە لەزۆرێك گۆڕانکاری وپەرەسەندن کە پێویستی بە تێکەڵکردنی نێوان ڕەسەنایەتی و نوێگەری هەیە .

٣- ڕاهێنانی پراکتیکی پۆستی سەرکردە ئەوەیە کەئاستی سەلامەتبوون وجددیەتی پڕۆژەی سەرکردایەتیکردن، وئاستی ڕەوایەتی ئەو نموونەیە نیشان دەدات کە بۆ ئەو کارە پێشنیازکراوە، هەندێك کەس گەر لە دەرەوەی دەوڵەتەکە بن ئەوا هیچ کەموکوڕی، یان ناتەواوییەکیان لێ بەدیار ناکەوێت، بەڵام ئەگەر ئەو لەلایەن حەقیقەت و واقیعی هەستپێکراو و گۆڕەپانی ئەزمونەکانەوە ناچار بکرێت ئەوا کەموکوڕی وپێشێلکارییەکانی بەدیار دەکەون، هەربۆیە زانایان پێداگربوون لەسەر تاقیکردنەوەی کاندیدان بۆ سەرکردایەتیکردن، پاشان بەتەنیایی جێیان نەدەهێشت تا تاڵی ئەزمونەکەو سەختی تاقیکردنەوەکە بچێژێت، بەڵکو هاوکاری و پشتیوانیان لێدەکرد تا بەهێزتر دەبوو.

٤- بێگومان بەدڵنیاییەوە ئامادەکردنی سەرکردەی خواناس وڕەبانی پێویستی بەمامۆستا وزانایانی خواناس وڕەبانی دەبێت، تا سەرپەرشتی پەروەردەکردن وئامادەکردنی ئەو سەرکردەیە لەئەستۆ بگرن، سەبارەت بەدید و تێڕوانینی خواناسین و ڕەبانیەتەوە[١].

٥- پەروەردەکردنی سەرکردە لەسەر هەڵگرتنی فکری ڕیسالی و پەیامی خودایی خاڵی بەهێزی مامۆستای پێگەینەر زانای خواناس ئاق شەمسەدینە.

---

[١] بروانە: مقالە : کیف تربی محمد الفاتح، موقع https ://ahlylovers.ahlamontada.com .

٦- ئەو سەرکردانەی هەڵگری هەمومی بانگخوازین بگەڕێوە بۆ فکری مامۆستاکەی دەزانی مامۆستاکەی خاوەن هەمومی ئومەتەو هەڵگری فکری گۆڕانکاری و تازەگەری و نەهزەیە.

٧- ئامادەکردنی سەرکردەی سیاسی و سەربازی و فکری کاری سەرەکی زانای ئایینی بوە، مێژوی هاتنی ئیسلام پڕە لەم سەرکردانە کەجیهانیان گۆڕیوە، ئاق شەمسەدین هەمان ئاڕاستەو مەنهەجی زانایانی گرتۆتە بەر بۆ پێگەیاندن.

٨- بەشداری کردنی مەیدانی لەجەنگ و جیهاد هاوتا لەگەڵ فێرکردنی زانست لەلایەن زانا ئاق شەمسەدین سری سەرکەوتنی پێگەیاندنەکەیە.

## لە دەرئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە سەبارەت بەژیانی زانا وسەرکردەی ڕۆشنبیر ئاق شەمسەدین بۆمان دەردەکەوێت:

١- شێخ ئاق شەمسەدین نموونەیەکە بۆ زانا وکارکردنی ئازاد کە لەگەڵ کێشەکانی ئومەتەکەی دابوە، زانست و شارەزایی و کارامەییەکەی خۆی دەخاتە خزمەتیەوە، لەقۆناغێکی مێژوویی چارەنووسازدا ژیاوە، تێیدا توانی سەرکردەیەك دروست بکات کە هەموو جیهانی بەرەو مێژوویەکی نوێ گۆڕی (ئەویش سوڵتان محەمەد) فاتیح بوو .

٢- خاوەنی بیرۆکەی پەروەردەیی بوو لەبوارە هەمە جۆرەکاندا، دەتوانرێت لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەکاربهێنرێت، هەروەها چەندان هەوڵی پەروەردەیی هەبووە، وەك نموونەیەك لەبواری کاری بانگەواز وچاکسازیکردنی کۆمەڵایەتی دادەنرێت .

٣- پێویستە سوود لەئەزموونی شێخ ئاق شەمسەدین وەربگیرێت بەشێوەیەك کە بەشداربێت لەخزمەتکردنی حەقیقەت وڕاستی (واقیع) وگەشەکردن وپەرەپێدانی کۆمەڵگاو ئامادەکردن ودروستکردنی سەرکردەدا.

٤- چاکسازیکردن لەپڕۆگرامەکانی خوێندن وپەروەردە لەسەر بنەمای تیۆری تەواوکاری زانستەکان ویەکبوونی زانست وزانیاری .

٥- پێویستە لەسەر زانایان ڕۆڵی خۆیان بگێڕن لەئامۆژگاریکردن و

ئاڕاستەکردنی فەرمانڕەوایان، هــەروەها ئامۆژگــاری ئومــەت بەگشــتی و گــەنجان بەتایبــەتی بکــەن، وە بــۆ جێگیرکردنیــان و ڕوونکردنــەوەی پەیامەکانیان وگەیشتن بەئامانجەکانیان، پێویستە ریرەوی زانایانی پیشــین بەرنەدەن ئەوانەی خاوەن هیمەت و خۆراگر بون.

## کاریگەریە فکریەکانی زانای بلیمەت ئاق شەمسەدین لەسەر سەرکردەی سیاسی محمد فاتیح

فــەرمودەکانی پیغەمبــەر (صــلی الله علیــە وســلم) بەشــێکن لەدامەزراندنی فکرو برۆژەی فکری، هەروەها بنــەمای داڕشــتنی نەخشــە ڕێگایەکــە بــۆ داهــاتو، لــەناو ئــەم بنــەما فکــری و نەخشــە ڕێگایانــە فەرمودەی فەتحی قوستەنتینیەیە کە هاوسەنکی هێزی بەتــەواوی لــەنیوان موسڵمانان و ڕوم گۆڕی، لەم سۆنگەوە بۆ ئەوەی سەرکردە **محمد** فاتیح وەك پڕۆژەیەکی فکری ئەم بابەتەی لەدڵ و دەرون و ناخی خۆیدا جێگیر بکات، بەردەوام لەسەر ناوەڕۆك و گرنکی قوستەنتینیەو فەتح کردنــی هــانی دەدا و وەك پڕۆژەیەکی فکری لەمێشکی سەرکردە **محمد** فاتحی چاند، هــەروەها بو بەخەونی شەوو ڕۆژی و بوە قەزیەیەکی ئەساسی ئومــەت لــەلای ئــەو، زانا ئاق شەمسەدین هەر لەمناڵیەوە ئەم فکرەی لەلا خۆشەویســت کــرد، **محمد** فاتیح کاری سەرەکی دوای کرتنە دەسەڵاَت ئەم بابەتە بو، ئێســتاش موسڵمانان بەگشتی و تورکەکان بەتایبەتی ئەم بابەتەیان وەك بنەمایەکی فکری تەماشا دەکــەن و گرنکــی پــێ دەدەن، وە شــانازی پیــوە دەکــەن، هــەروەها ئێســتاش لــەنێوان موســڵمانان و ڕوم و ئــەوروپای ئێســتا ئــەم

ململانییە فکریە هەر ماوە، ئینجا بزانە دارشتنی بنەمای فکری چەندە گرنگە بۆ پێگەیاندن، دیاری کردنی قەزیەیەك وەك فکر چۆن کاریگەری لەسەر ڕەوڕەوەی مێژوو هەروەها داهاتوش دروست دەکات، بۆیە زانای ئایینی دەبێت لەبیری دروستکردنی بنەمای فکری دا بێت، هەروەها ڕۆلەکانی لەسەر قەزیەی ئومەی ئیسلامی بینا بکات، ئینجا دەتوانی سەرکەوتنی گەورە بەدەسیت بێنی و بەئاسانی سەرکردەی سیاسی پێبگەینێت، ئێستا چونکە خاوەن قەزیە نین و بابەتی فکر لەلامان کال بۆتەوە هەنگاوەکانمان بێ بەرهەمن و سەرکردەی سیاسی بەهێز دروست نابێت بەتایبەتی لەمەدرەسە ئیسلامیەکان.

# چەند پێشنیارێک:

١- ئومەتەکەمان لەم قۆناغە سەختەدا پێویستییەکی زۆری بەم جۆرە پڕۆژانە هەیە، کە دەتوانرێت بەهۆیەوە ووزەی گەنجان چالاك بکات و پڕچەکیان بکات بەزانست وکارامەیی پێویست و داواکراو، بەرنامە و پلانە دوور مەوداکان ئامادە بکرێن بۆ بەرهەمهێنانی سەرکردەی نوێگەر و داهێنەرانە لە زانستەکانی دین و دونیایدا (جیهانیدا)، لەبەرئەوەی ئەوان پایە وکۆڵەکەی سەرەکی شۆڕش وهەستانەوەی ئومەتی ئیسلام و، پێشخستنین لە هەموو ئاست و لەسەرجەم کایەکاندا .

٢- پێویستە لەسەر زانایان ودەسەڵاتداران لەکۆمەڵگادا کەدەست بکەین بەچاکسازیکردن لەخۆماندا، وچاودێری و موحاسەبەی خۆمان بکەین لەهەموو بچووك و گەورەیەکدا بۆ ئەوەی ببینە پێشەنگێکی باش، بۆ تازە پێگەیشتوان و لاوانی ئەم ئومەتە .

٣- لەسەر خوێندنگەکانی شەریعەت پێویستە لەپرۆگرامەکانیاندا سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگە لەخۆ بگرێت و باسەرنجیشیان لەسەر توێژی لاوان بێت، لەپێناو دروستکردنی کەسانی هەڵبژێردراو وباش و گرنگیدان پێیان بێت، ڕەنگە شۆڕش و هەستانەوەی ئومەتەکەمان لەسەر دەستی ئەوان بێت لەرۆژهەلات و ڕۆژئاوای سەرزەویدا.

٤- ئەم زانستە بەشێوەیەکی بەرچاو لە ڕۆژئاوادا گەشەی کردووە،

بۆیــە پێویســتە لێکۆڵینــەوە لــە شــێوازەکانی پــەروەردەی هاوچــەرخ بکەینەوە، تا سوودی لێوەر بگرین لەدروستکردنی سەرکردەی گونجـاو بـۆ ئەم سەردەم و سەدەیەمان .

خودای گەورە پاداشتی سەرجەم ئەو زانا بەرێزانە خاوەنی ئەم پڕۆژە شارستانێتیە بداتەوە، لەپای ئەو کات و هــەوڵ و پارەیــەی کــە ســەرفیان کردووە و ... لەکۆتاییدا دەڵێین: ( ربنا لاتزغ قلوبنا بعـد اذ هـديتنا انـك انت الوهاب ) واتە : (ئەی پــەروەردگار دڵمــان لەحــەق لانــەدەی لــەدوای ئەوەی کەهیدایەتی ئێمەت دا بۆ حەق) .

## کۆتایی:

ئەم نوسراوە هەوڵێك بوو بۆ تیشك خستنەسەر ئەم لایەنە پشتگوێ خراوەی ڕۆڵی زانایان بۆ دروستکردنی سەرکردایەتیکردن و قیادەی سیاسی.

١- خوێندنگە نیزامییەکان بازدانێکی جۆری وزانستی گەورەیان لەسەر ئاستی شارستانێتی ئیسلامی وجیهانی پێشکەش کرد، هەوڵێکی زۆریانداوە لەبەرپەرچدانەوەی بیرۆکە لادەرەکان لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی زانست و ئایینداری سوننی وناوەندێتی وپاراستنی نەوەکان، کاریگەرییە زانستی ورۆشنبیری وسیاسی و هەستانەوەو شۆڕشەکانی تا ئێستاش بەردەوامی هەیە .

٢- پێویستە لەسەرمان کار لەسەر ئاراستەکردنی ووزەی گەنجان بکەین و پلانی دوور مەودا دابنێین، لەپێناو دەرهێنانی سەرکردەی نوێ و نوێخواز لەزانستەکانی دین ودونیاییدا، خەرجییەکان بۆ زانست وفێۆخوازان و توێژینەوەی زانستی زیاتر بکەین، کۆڕ وکۆنفرانس ببەسترێت بۆ وەستان لەسەر هەنگاوە زانستی و لێکۆڵدراو بۆ بەگەڕخستن وسوودوەرگرتن لەگەنجە هۆشیار ودیارەکانی ئومەت، پشتیوانیکردنی سەرجەم ئەو پڕۆژانەی کەدەبنە هۆی هەستانەوە وپێشخستنی زانست وزانایان .

٣- ئەرکێکی گەورە دەکەوێتە سەرشانی زاناو بیرمەندان

لەئاڕاستەکردنی کەسە بەتوانا وپارەدارانی نێو باوەڕدارارن، بۆ هۆشیارکردنەوەیان لەگرنگی بەخشین بۆ پشتیوانیکردنی پرۆژە زانستییەکان و، ئەوقافی ئیسلامی و دەستەبەریکردنی خوێندکارە هۆشیار ودیارەکانی زانست، هەروەها پێویستە خوێندکارانی زانست کار لەسەر ئاڕاستەکردنی نیەت وئامانجەکانیان بکەن، لەپێناو خزمەتکردنی زیاتری دینەکەیان و بەرزکردنەوە و پێشخستنی شارستانێتییەکەیان .

ئەمڕۆ ئێمەش ئەوەمان لەسەرە کە هۆشیاری بڵاوبکەینەوە سەبارەت بەبابەتی پەروەردەی باش وچاك و دروستکردنی سەرکردە لەسەردەستی زانا بەڕێزەکان، بەپێ ی بینچینەیەکی زانستی دروست، پشت بەست بە ئاڕاستەکردنی شەرعی خودای دانا، وئەزمونە زانستیە هاوچەرخەکان، یاخود پێشینەکان کەلە باب و باپیرانمانەوە پێمان گەیشتووە[1].

[1] بروانه: المدارس النظامية وحاجة الآمة لمنهجية التعليم البناء، لينة عشا، ودولة السلاجقة، د. علي الصلابي، ص ٢٨٩.

## سەرچاوەکان :

١. جامع البيان للطبري .

٢. صحيح البخاري .

٣. كتاب سير أعلام النبلاء .

٤. المكتبة الشاملة الحديثة .

٥. الكامل في التأريخ .

٦. عيون الروضتين .

٧. الكامل في التأريخ .

٨. البداية والنهاية .

٩ . صبح الآعشى .

١٠. مسند أحمد .

١١. مجمع الزوائد .

١٢. مستدرك الحاكم .

١٣. دولة السلاجقة .

**مقالات ومواقع الكترونية :**


١- https ://ahlylovers.ahlamontada.com. كيف تربى محمد الفاتح موقع :

٢- مقالة : المدارس النظامية وحاجة الآمة لمنهجية التعليم البناء، لينة عشا .

٣- قضية القيادة الربانية : قراءة في فكر قائد رباني، كيق تعد قائدا ربانيا - محمد الفاتح – نموذجا، المؤلف : رنيم أبو الشامات :

٤- https :// www.annajah.net

٥- https :// www.annajah.net ٤ . كيف تعد قائدا ربانيا :

٦- نظام الملك يمهد لمقدم العثمانيين بأنتصار ملاذكرد و صلاح الدين يفكك الدولة العميقة للفاطميين، تعرف على أهم وزراء الاصلاح،

٧- https: \\ www. Aljazeera.net \ author عبدالله الطحاوي

٨- الوزير السلجوقى نظام الملك رائد مؤسسة التعليم في العالم الآسلامي، الدكتور علي أجقو، قسم العلوم الآنسانية، جامعة بسكرة، مدونة

٩- الآستاذ الدكتور خليل حسن الزركاني، هذة المدونة كتبت من أجل مساعدة الآخرين وصاحبها يضع نفسه من أجل خدمة قرئها، تأسست هذه

١٠- المدونة سنة ٢٠٠٦ م .

١١- https:\\albosala.com.مقالة ( المدارس النظامية وحاجة الآمة لمنهجية التعليم البناء ) منشور

١٢- https:\\albosala.com .

١٣- أثر العلماء في مشروع النهضة .

# ناوەڕۆک

**دیاری بۆ:............................................................................ ٦**

**پێشەکی: ........................................................................... ٧**

**خوێنەر: .......................................................................... ١٣**

**سودی ئەم کتیبە چیە؟ ........................................................ ١٥**

**بۆچی ئەم بابەتەم هەلبژارد؟. ................................................ ١٨**

**ناسنامەو پێگەی کەسایەتی سیاسی و فکری زانای سەرکردە (نیزام پادشا) ........... ٢٣**

هەولە پەروەردەییەکانی نیزام پادشا وسەرخستنی سەرکردەکان:.......................... ٢٧

ئومەت لەسەر دەستی زانایەکی خواناس و ڕەبانی نیزام پادشا دەژێیتەوە: ............. ٢٨

ئامانجە پەروەردەییەکانی خوێندنگە نیزامییەکان: ....................................... ٣١

هۆکارەکانی سەرکەوتنی خوێندنگە نیزامییەکان: ....................................... ٣٤

ناودارترین زانا ودەرچووانی خوێندنگە نیزامییەکان....................................... ٣٦

پڕۆژەی فکری خۆیندنگەی نیزام پادشا لە پێشخستنی بزافی زانستی و ڕۆشنبیریدا: ... ٣٨

ڕۆلی نیزام پادشا لەبواری فکری و یەکلاکردنەوەی ململانیکاندا ........................ ٤٢

رۆلی زانای ئاینی خواناس نیزام پادشا لەبواری سیاسەت. ............................. ٤٦

زانای ئاینی و پیگەیاندنی سەرکردەی سیاسی. ........................................ ٤٨

دەستکەوتە گەورەو گرنگەکانی زانای خواناس و سیاسی نیزام پادشا ................. ٤٩

ناسنامەو پێگەی زانای ئاینی و کەسایەتی زانستی و فکری زانای ژیر و وشیار (ئاق شەمسەدین) ........................................................................ ٥١

دەروازەی ناسین: ................................................................. ٥١

ناسنامەی زانای پایەبەرز مامۆستا ئاق شەمسەدین .................................. ٥٢
پرۆگرامی پەروەردەیی زانا خواناس و ڕەبانییەکان بۆ دروستکردنی کەسایەتی سەرکردە
محەمەد فاتیح. ...................................................................... ٥٥
زانا ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیل گۆرانی کوردی ........................................ ٥٥
مامۆستای دووەم بریتیە لە شێخ و زانای گەورە محەمەدی کوڕی هەمزە ئەلڕوحیە ناسراوە
بە شێخ (ئاق شەمسەدین). ............................................................ ٥٧
هەوڵەکانی شێخ ئاق شەمسەدین لەپەروەردە وفێرکردنی سوڵتان محەمەد فاتیح
وهەوڵەکانی لەئازادکردنی قوستەنتینیەدا. ............................................ ٦٠
هەڵوێستێکی گەورە ...................................................................... ٦١
چۆنیەتی سوود بینین لەپرۆگرامی پەروەردەیی شێخ ئاق شەمسەدین بۆ دروستکردنی
سەرکردە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا: ...................................................... ٦٢
لە دەرئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە سەبارەت بەژیانی زانا وسەرکردەی ڕۆشنبیر ئاق
شەمسەدین بۆمان دەردەکەوێت: ........................................................ ٦٥
کاریگەریە فکریەکانی زانای بلیمەت ئاق شەمسەدین لەسەر سەرکردەی سیاسی محمد
فاتیح ...................................................................................... ٦٦
**چەند پێشنیارێك: ........................................................................ ٦٨**
**کۆتایی: .................................................................................. ٧٠**
**سەرچاوەکان: ............................................................................ ٧٢**
**ناوەڕۆك .................................................................................. ٧٥**

# ڕۆڵی زانایانی ئاینی
# لە پێگەیاندنی سەرکردەی سیاسی دا

لەم کتێبەدا شێواز وپڕۆگرامی پەروەردەیی دووان لە زانایانی ئیسلامم لە سەدەکانی ڕابردوودا باسکردووە، کە زۆر هیمەت بەرز بوون، هەردووکیان خەمی پێگەیاندن و ئامادەکردن و دروستکردنی سەرکردەیان هەڵگرتووە لەپێناو هەستانەوە و پێشکەوتن وچاکسازی، پێم وایە ئەوەی کە ئەوان ئەنجامیانداوە خودای گەورە لە هەردووکیان خۆش بێت نمونەیەکە کەشوێنیان بکەوین وڕێگایەکە وپڕۆگرامێکی پەروەردەییە کەپێیدا بڕۆین، ڕەنگە زانایانی سەردەم و ریکخراوو و دەزگاکانی پیگەیاندن و دەروونێکی باش وچاک ببینێت پێ ی وابێت پشت بەخودای گەورە هاوکار دەبێت و مەنهەجەکەیان دەکاتە بنەما بۆ هەستانەوە و بۆ ئەنجامدانی چاکسازی ودروستکردنی سەرکردە لەسەردەمی ئێستاماندا.


نرخی 2000 دینار

9 789922 690285

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com